

# ژیان لەسایەی ئیماندا و ڕەواندنەوەی گومانەکان

عەلی باپیر


بڵاوکردنەوەی
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

نەخشەسازی
جمعە صدیق کاکە

خـەت
نـەوزاد کۆیـی

نۆرە و ساڵی چاپ
یەکەم ١٤٣٨ك - ٢٠١٧م

قەبارە
٢١*٢٤ (١١٢) لاپەڕە

تـیراژ
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان،
ژمارەی سپاردنی ( ٢٦٥ ) ی ساڵی ٢٠١٧ی پێدراوە





**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پاڵاس

/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

## پێشکەش بێ

بە هەموو ئەوانەی بەردەوام لە هەوڵی
بەهێز و پتەوکردنی ئیمان و
عەقیدەیانو، ڕەواندنەوەی تەم و مژی
گومانان دان، تاکو بەردەوام دڵ و
دەروونیان پاك و ساغ و سەلامەت
بێو، سەرەنجام دڵنیایی و هێمنیی
دنیاو، بەختەوەریی قیامەتیان
بەقسمەت بێ.

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾

أما بعد:

خوێنەرە سەنگینو شیرینەکانم!

دنیای ئەمڕۆ "لەم ڕۆژگارەدا" بەگشتیی لەلایەن زلهێزانێکەوە بەڕێوەدەبرێو ڕێنمایی دەکرێو نەخشەی بۆ دادەنرێ، کە کەمو زۆر، حیساب بۆ خوا "عز وجل"و وەحییو پێغەمبەرانو ڕۆژی دواییو لایەنی مەعنەوییو ڕەوشتو ئاکار ناکەنو، ژیانی مرۆڤ تەنیا وەك لایەنە ماددییەکەیو، مرۆڤیش بەس وەك جەستەو غەریزەکانو، لایەنەئاژەڵییەکەی دەبیننو، ئەوەی خوای کاربەجێ لەئایەتی (١٢)ی سوورەتی (محمد)دا فەرموویەتی، لەسەدا سەد (١٠٠%) بەسەریاندا دەچەسپێ: ﴿...وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾، واتە: وەئەوانەی بێبڕوان: ڕادەبوێرنو دەخۆن، وەك چۆن ئاژەڵ دەلەوەڕێن، ئاگر-ی دۆزەخ-یش جێگاو ماوایانە.

هەربۆیەش لەم ڕۆژگارەدا ژیانو گوزەران بەڕێکردن بەپێی ئیمان، لەلایەکەوە، یەکجار گرنگو پێویستە، تاکو مرۆڤ نەکەوێتە ژێر ڕکێفی شەپۆلو تەوژمی ماددیگەرییو ئارەزوو پەرستییو، لەلایەکی دیکەشەوە یەکجار قورسو زەحمەتە، چونکە ژینگەو کەشو هەوای دنیا وای لێکراوە، لەگەڵیدا دژو پێچەوانەیەو، لەزۆر لاوە لەگەڵیدا تێك دەگیرێ.

بەڵام ئەوەی وا لەبابای مسوڵمان دەکات، کە خۆی گورجو گۆڵ بکاتو، نارەحەتییەکانی خواپەرستییو بەپێی ئیمان، ژیان، هەرچییەك بن، تەحەمولیان بکاتو گوێیان پێ نەدات، ئەوەیە، کە:

١- دەزانێ کە ژیانی دنیا شوێنی تاقیکرانەوەیە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ الکهف -٧-، واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەمینە کردوومانەتە مایەی ڕازانەوەی، تاکو تاقییان بکەینەوە، کامیان کردەوەی باشترە.

ئاشکراشە بابای تاقیکراوە (ممتحن) نابێ لەگەرمەی تاقیکرانەوەدا چاوەڕێی ئەوەبێ، ئەرك و ئازارو گرفتاریی و نارەحەتییان نەبینێ.

٢- ژیانی دنیا لەچاو ژیانی ڕۆژی دوایی، شتێکی زۆر گچکەو نابووت و زوو تێپەڕە، وەك دڵۆپەیەکە بەرانبەر دەریایەك و، بگرە کەمتریش، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ ...أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ التوبة -٣٨-، واتە: ئایا ژیانی دنیاتان بەسەر دوارۆژدا هەڵبژارد؟ ڕابواردنی ژیانی دنیا لەچاو دوارۆژدا، لەکەمێك بەولاوە چیدیکە نیە.

پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لەفەرموودەیەکیدا چەمکی ئەو ئایەتە موبارەکە، زۆر جوان وێنا دەکات: (ما الدنيا في الآخرة إلا مثل ما يجعل أحدكم أصبعه في اليَمِّ، فلينظر بما يرجع ؟) رواه مسلم. واتە: ژیانی دنیا لەچاو دوارۆژدا، تەنیا وەك ئەوە وایە: یەکێکتان پەنجەی بخاتە ئاوی دەریاوە، با سەرنج بدات چەندەی ئاو بەپەنجەیەوە هاتوە!

شـایانی باسیشـە، کـە ئـەهلی کـوفرو نیفـاق لەهـەوڵی بـەردەوامو نەپساوەدان، بۆ دوور خستنەوەی مسـولْمانانو، وروژانـدنی ئـەو پرسـیارو ئیشکالانەی، کە پێیان وایە هۆکـاری خسـتنە دوودڵیـیو گومانـدارکردنی مسولْمانانن، تاکو ئەوەی کە لەو بوارەدا سەلامەت دەرچوو، بیخەنە بۆسـە (کمین)ی گومانو دوو دڵییان (الشبهات)ەوە!

ئێمەش هەوڵمانداوە کە لەم نووسراوەدا:

یەکەم: بەکورتییو پوختییو خێرایی: تیشك بخەینە سەر ژیانو گوزەران لەسایەی ئیماندا، کە چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانی تاكو کۆمەڵ هەیـەو، گرنگییو پێویستییەکەی چییەو چۆنە؟!

دووەم: هـەروەها هەوڵیشـمان داوە: تـەمو مـژی کۆمـەڵێك پرسـیارو ئیشـکال برەوێنینـەوە، کـە بەمەبەسـتی دوورخسـتنەوەی مسـولْمانان، لەئیمانو ئیسلام لەلایەن ناحەزانی مسولْمانانەوە، دەوروژێنرێن.

هیواداریشم ئەم بەرهەمە " لەگەڵ بچووکیشیدا " کـەڵێنێکی زۆربـاش بگرێ.

٢٩/ جەمادی دووەمی ١٤٣٨ك

٢٨/مایسی ٢٠١٧ز

هەولێر

# ئەم كتێبە

زۆربەی دەقی ئـەو وتارەیـە، کـە بـە هـەمان ناونیشـان، لـە کۆڕێکـدا پێشـکەش کـرا، لـە هـۆڵی (شـارەکەم)دا، لـە شـاری قـەڵادزێ، لـە ڕۆژی ١٠ـ ١ـ ٢٠١٧ز، تەواوی ئەو وتارەش لەم لینکەدایە:

(www.youtube.com/watch?v=YNLmu1IdDuE

دوای ئەوەی لە لایەن ڕێکخـراوی (ئاڕاسـتەی دروسـت)ەوە تایـپ کـرا، خۆیشم چاوم پێداگێڕایەوە و دەستێکم پێدا هێنا.

شایانی باسیشە، کە بەندە لە مێژە کار لەسەر بواری ئیمـان و عەقیـدە دەکـەم، چ وەك ڕوونکردنـەوەی ئیمـان و عەقیـدەی ئیسـلامیی و، چ وەك بەرپەرچـدانەوەی بیرۆکـە دژ و نـەیارەکانی عەقیـدەی ئیسـلامیی و، ڕەواندنەوەی تەم و مژی ئـەم گومانانـەی، لـەو بـارەوە دەورووژێنـرێن، کـە دەتوانم ئاماژە بەم بەرهەمانە بکەم:

١ـ دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام ڕێچکان.

٢ـ پوختەیەك دەربارەی ئیسلام.

٣ـ خواناسیی ، ئایین ، ئیمان: ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە و، ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە.

٤ــ ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا(١-٦).

٥ـ ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی.

٦ـ موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله.

الكتاب الأول ـ الإسلام معرفة صحيحة بالخالق و الخلق.

الكتب: الثاني والثالث والرابع والخامس والسادس والسابع والثامن: الإسلام: إيمانٌ بالله وملائكته وكتبه ورسوله واليوم الأخر.

لەم نووسراوەشدا، لە سێ تەوەردا قسەمان لەسەر دوو بابەت کردوە:

**تەوەری یەکەم: ژیان لە سایەی ئیماندا:**

کە لە ژێر پێنج ناونیشاندا لە بارەی ئیمانەوە دواوین، چ وەك پێناسەی، چ وەك خستنە ڕووی پێکهاتەکانی و پایەکانی، چ وەك شیکردنەوەی و، کاریگەریی و ڕۆڵی لە ژیانیی مرۆڤ دا و، شوێنەوارە بەپیزەکانی لە ڕەهەندە جۆراو جۆرەکانی ژیان و گوزەرانی تاکیی و کۆمەڵیی دا.

**تەوەری دووەم: ڕەواندنەوەی گومانەکان:**

کە تێیدا حەوت (٧) گومانی سەرەکییمان ڕەواندوونەوە، پێنجیان لەبواری خواناسیی دا و، یەکیان لە بواری پێغەمبەرناسیی و، یەکیشیان لەبواری شەریعەت دا.

تەوەری سێیەم: لە ژێر ناوونیشانی: (چەند وەڵامێکی کورت و خێرای کۆمەڵێك پرسیار و ئیشکال)ـدا تەم و مژی یازدە (١١) پرسیارو ئیشکالی جۆراو جۆری دیکەمان ڕەواندۆتەوە، کە لە دووتوێی وتاری کۆڕەکەدا جێیان نەبۆتەوە.

هیواداریشم مسوڵمانان بە گشتی و بە تایبەتی، چینی گەنج و لاوی خوێندەوارمان، هەوڵبدەن هەرچی زیاتر لە ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروستی خوای بەرز و مەزندا، بە ئیمان و عەقیدە و شەریعەتەکەیەوە، شارەزاتر و بەرچاو ڕوونتر بن، تاکو لە بەرانبەر ڕەشەبای شەهوەت و شوبهەکانیش دا، خۆڕاگرتر و نەلەخشاوتر بن.

# دەستپێك

بەڕێزان!

ئێمە لە دوو تەوەردا بابەتەکەمان پێشکەش دەکەین، لە تەوەری یەکەم دا، بە کورتیی پێناسەی ئیمان دەکەین و پێکهاتەکانی دەخەینە ڕوو، پاشان باسی گرنگیی و پێویستیی ئیمان لە ژیانی مرۆڤدا، دەکەین، دواتریش لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێکدا، باسی چۆنیەتی ژیانی مرۆڤ دەکەین، لە سایەی ئیمان دا، پاشان باسی بەرهەم و شوێنەوارەکانی ئیمان دەکەین، لە چەند خاڵێك دا.

لە تەوەری دووەمیش دا، تەم و مژی چەند گومانێك دەڕەوێنینەوە، لەبوارەکانی: ( خواناسیی و، پێغەمبەر ناسیی و، شەریعەت)دا.

## ١-ناساندنێکی کورت بۆ ئیمان:

ئیمان: بریتیە لە تەماشاکردنی بوون(وجود) بەو چاوە، کە ئەو بوونە، بێ بەدیهێنەرو خاوەن نیە، بەدیهێنەر و خاوەنێکی هەیە، ئەو خاوەنەش سەرپەرشتیی دەکات و ئاگای لێیەتی.

ئنجا لە نێو ئەو بوونەش دا، مرۆڤ بێ خاوەن و مشوور خۆرو بێسەرپەرشت نیە.

بەڵێ، خولاسەی ئیمان ئەوەیە: کاتێك ئێمە بوون (وجود) دەبینین، پێمان وا نەبێ، کە شاری بێ خاوەنە، ئنجا مرۆڤ کە لە نێو بووندا دەبینین، پێمان وا نەبێ، کە هەروا لە خۆڕا ڕێی کەوتۆتە ژیان و، لەسەر گۆی زەوی پەیدا بووە! بەڵکو بزانین و دڵنیابین، کە ژیان خاوەنێکی هەیە، مرۆڤیش پەروەردگارێکی هەیەو پەرستراوێکی هەیەو بە دیهێنەرو مشورخۆرێکی هەیە، لەسەر زەوی دایناوەو حیکمەت و ئامانجێکی ڕەچاو کردوە، کە ئەو مرۆڤەی خولڤاندوەو لەسەر زەوی دایناوە، ئنجا ئەگەر مرۆڤ ئەو حیکمەتو ئامانجەی خوا لە وەدیهێنرانی دا، نەهێنێتەدی، لەسەر بوون(وجود)ەکەی قەرزدار دەبێتەوەو، لە سەودای ژیان دا دەدۆڕێ و، ڕەنج بە خەسار و مایە پووچ دەکەوێتە گۆڕێ.

## ٢-چوار پێکهاتەکەی ئیمان و پایەکانی:

ئیمان پەیوەندیی بە عەقڵەوە هەیە و، پەیوەندیی بە دڵ و دەروونەوە هەیە و، پەیوەندیی بە زمانەوە هەیە و، پەیوەندیشی بە جەستەو ئەندامەکانەوە هەیە، چونکە ئینسان چوار هێزی هەن:

١ـ عەقڵ: کە شتەکانی پێ کەشف دەکا و دەرك دەکات.

٢ـ دڵ : کە شتەکانی پێ ڕەفز دەکات، یان قبووڵ دەکاتو شتەکانی پێ خۆشدەوێت، یاخود ڕق لێدەبێتەوە.

٣ـ زمان: کە بیرو ڕای خۆی پێ دەردەبڕێ.

٤ـ جەستە: (ئەندامەکانی جەستە) کەکردەوەکانی پێ جێ بە جێ دەکات. (ئەندامەکانی جەستە).

ئنجا ئیمان پەیوەندیی بە هەرکام لەو چوار هێزەی ئینسانەوە هەیە، چونکە ئیمان بریتیە لە:

<u>یەکەم</u>: پەیبردن و زانین و دڵنیابوونی عەقڵ لە:

١-ناسینی خوا (سبحانه و تعالی) بە عەقڵ، بەو شێوەیەی، کە خوا خۆی بە ئێمە ناساندوە.

٢- پاشان زانینی ئەو ڕاستییە، کە خوا کۆمەڵێك فریشتەی هەن.

٣- دەرككردن و دان پێداهێنانی ئەو ڕاستییە، کە خوا بەو فریشتانەدا، چەندان پەیامو بەرنامەی ناردوون.

٤- ئەو پەیام و بەرنامانەش، کە خوا بە فریشتان دا ناردوونی بۆ لای کۆمەڵە مرۆڤێکی پاك و چاك و شایستە، کە بریتین لە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

٥- ڕۆژێکیش هەیە، کە ڕۆژی دواییەو، ئێمە تێیدا بە دیداری خوا دەگەینەوە.

ئەوانەش هەر پێنج پایە سەرەکییەکەی ئیمانن، دیارە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) باسی پایەی شەشەمیش کراوە، کە بریتیە لە: ئیمان بە قەدەر، واتە: خوا ئەم بوونەی بە ئەندازەگیریی داناوەو، هەروا هەڕەمەکیی و بێ یاسایی نیە، بەڵکو هەموو شتێکی بە یاساو سیستم (نظام) داناوە، ئنجا ئیمان بە قەدەر بریتیە لەوە: بڕوات بەوە هەبێ، کە خوا هەموو شتێکی بە نەخشەو ئەندزەگیریی داناوە.

بەڵێ، سەرەتا دەبێ بە عەقڵ، ئەو ڕاستییانە دەرك بکرێن و بزانین بەشێوەیەکی جێی دڵنیاییو دوور لە دوودڵیی (شك).

دووەم: پاشان دەبێ بە دڵ ئەو ڕاستییانە قبووڵ بکرێن، چونکە هەیە بەعەقڵ دەزانێ، کە ئەوانە هەق و ڕاستن، بۆ نموونە: فیرعەون دەیزانی، کەمووسا (علیه السلام) پێغەمبەری خوایە، وە ئیبلیس دەزانێ: خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارە، هەروەها ئەبو جەهل دەیزانی موحەممەد (علیه السلام) پێغەمبەری خوایە، بەڵام ئایا (فیرعەون و ئیبلیس و ئەبوجەهل) بە ئیماندار لە قەڵەم دراون؟ نەخێر، بۆ چی؟ چونکە بەعەقڵ زانیویانەو دەرکی ئەو ڕاستییانەیان کردوە، بەڵام بەدڵ قبووڵیان نەکردوون.

سێیەم: دەبێ بە زمانیش دانیان پێدا بهێنرێ.

چوارەم: پاشان دەبێ بە ئەندامەکانیش پیادە بکرێن و پابەندییان پێوە بکرێ.

ئنجا بە هەر کام لەو چوارە، پێکەوە و وێکڕا: ئیمان دروست دەبێ.

پایەکانی ئیمانیش وەك باسم کردن، پێنجی سەرەکیین، هەندێکیش بەشەشیان دادەنێن: ئیمان بە خوا، بە فریشتەکانی خوا، ئیمان بە کتێبەکانی خوا، ئیمان بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئیمان بە ڕۆژی دوایی، ئیمان بە قەدەر و قەزا.

### ٣-گرنگیی و پێویستیی ئیمان:

ئینسان بۆ ئەوەی بۆ چەند پرسیارێکی فەلسەفیی وەڵامی ڕاست و دروستی دەست بکەوێ ، چەند پرسیارێکی فیترِی، کە لە عەقلّ وهۆشی هەموو کەسدا هەن، ناچارە ئیمانی هەبێت، ئەگەرنا وەڵامی ڕاست و دروستی دەست ناکەوێت:

١- ئەم بوونە چییە؟

٢- کێ خاوەنیەتی؟

٣- بۆچی بەدیهێناوە؟

٤- من کێم؟

٥- لە کوێ هاتووم؟

٦- بۆچی هاتووم؟

٧- بۆ کوێ دەچم؟.

ئەو پرسیارانە سەرجەم فەیلەسووفەکان بە درێژایی مێژوو هەوڵیان داوە، وەڵامی ڕاست و دروستیان دەست بخەن، بەڵام بێجگە لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، هیچ کەس نەیتوانیوە وەڵامی ڕاست و دروستی ئەو پرسیارانە دەست بخات، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە، کە عەقڵی مرۆڤ سنووردارە، وەك چۆن جەستەی مرۆڤ سنووردارە، ئەندازەیەك لە بۆشایی داگیر دەکات و قەبارەیەکی دیارییکراوی هەیە، وەبینینی ئینسان هەتا مەودایەك دەتوانێ ببینێ، هەتا مەودایەك دەتوانێ بۆ دووریی، وە هەتا مەودایەك بۆ شتی ورد، ئێمە هیچ کام لە: گەردیلە، مۆڵکۆڵ، شانە، خانە، ڤایرۆس، تیشکی ژێرسوور، تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، هێزی موگناتیسیی، هێزی کێشندە (جاذبیة)، نابینین، هەروەك هیچ کام لە: جینن و فریشتە و ڕووحیش، نابینین.

هەروەها هێزی بیستنی ئینسان، بە هەمانشێوە سنووردارە: گوێی ئینسان لە بیست (٢٠) لەرینەوە(ذبذبة) دەبیستێ، هەتا بیست هەزار (٢٠٠٠٠)، نە لە (٢٠٠٠٠) زیاتر دەتوانێ وەرگرێ و ببیستێ، نە لە (٢٠)یش کەمتر دەتوانێ ببیستێ.

ئنجا عەقڵی ئینسانیش بە هەمانشێوە سنوور دارە: ئینسان ناتوانێ هەموو شتێك بە عەقڵ بزانێ، بۆیەش خوا (سبحانە و تعالی) لە ڕێی وەحی و پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) خۆی بە ئێمە ناساندوەو، خۆشمانی پێ ناساندووینو، ئەم بوونەشی پێ ناساندووینو تێشیگەیاندووین:

١- لە کوێوە هاتووین؟

٢- بۆچی هاتووین؟

٣- بۆ کوێ دەچین؟.

کەواتە: ئیمان پێویستە بۆ ئەوەی عەقڵی ئینسان تێر (إشباع) بێت و وەڵامی ئەو پرسیارە ئەزەلییانەی دەستبکەوێت، کە:

من چییم؟ ئەم بوونە چییە؟ بەسەرهاتی چییە؟ حیکمەت لەدروستکردنی من چییە؟ لە کوێوە هاتووین؟، بۆ کوێ دەچین؟

ئنجا لە ڕاستییدا خوا (سبحانه و تعالى) کارێکی وای کردوە، کە:

١- ئێمە بە عەقڵ خوا بناسین.

٢- بە فیترەت و دڵ و دەروون خوا بناسین.

٣- ئەگەر تەماشای مێژوو بکەین، خوا دەناسین.

٣-ئەگەر تەماشای دەوروبەرمان بکەین، خوا دەناسین.

٤- بۆیە هەندێ لە زانایان گوتوویانە: (الطرق إلى الله بقدر أنفاس الخلائق) واتە: ڕێیەکان بەرەو خوا، بۆ ناسینی خوا، بە ئەندازەی هەناسەکانی دروستکراوەکانن، ڕێی بەرەو خوا چوون، زۆر زۆرن.

ئنجا یەکێ لەو یاسا عەقڵییانەی، کە هەموو عەقڵمەندانی دنیا لەسەریان پێکهاتوون، بریتیە لەو یاسایەی، کە دەڵێ: (هەموو پەیدابوویەك پەیداکەرێکی هەیە)،(لِكُلِّ حادِثٍ مُحْدِثٌ)، هەروەها یاسایەکی دیکەی عەقڵیی هەیە دەڵێ: هەموو ڕێکخراوێك، هەموو شتێکی ڕێکخراو (مُنَظم) و سیستماتیك، دەبێ ڕێکخەرێکی هەبێت،( لِكُلِّ نظامٍ مُنَظِّم)،

ئـەو دوانـە دوویاسـای عـەقڵیین، چـونکە هـەرکامێك لـە ئێمـە کتێبێـك لەشوێنێك ببینێ، دەزانـێ نووسـەرێکی هەیـە، وە هـەر کامێـك لـە ئێمـە لەشوێنێك کۆشکێك ببینێ، دەڵـێ: مسـۆگەر بەننایـەك دروسـتی کـردوە، ئەندازیارێك نەخشـەی بـۆ دانـاوە، و چـەند وەسـتاو کرێکارێـك دروسـتیان کـردوە، ئنجـا ئـەم بوونـەوەرە لـە هـەموو کۆشـکێك سەرنجڕاکێشـترە، وەجەستەی مرۆڤ، لە هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ دروستیان دەکات، ئاڵۆزترە و وردەکاریی زیاتری تێدایە، ئنجا سەیر ئەوەیـە، مـرۆڤ ئەگـەر سـەعاتێك ببینێ، هەرگیز ئەگەری ئەوە دانانێ بڵێ: ئەو سـەعاتە لـە خـۆوە دروسـت بـووە، بـەڵام مێشـکی مـرۆڤ، کـە لــە هەشـتاو شـەش ملیـار (٨٦.٠٠٠.٠٠٠.٠٠٠) خانـە پێکهـاتوەو، هـەر خانەیـەکیان چـەند بەرامبەری سەعاتێك وردەکاریی زیاتری تێدایە، کەچی مرۆڤـی وا هەیـە: پێـی وایـە بـێ خاوەنـە و هـیچ کـەس دروسـتی نـەکردوە و مشـووری لێ نەخواردوە!! چ عەقڵێك قبووڵ دەکات ئەو مێشکە بـەو هـەموو ئـاڵۆزیی و وردەکارییەوە، لە خۆوە دروست بووبێ؟!، ئنجا هەموو خانـەو شـانەکان و، ئەندامـەکان و کۆئەندامـەکانی دیکەی جەستەی مرۆڤ؟ بۆ نموونە: ئـەوە دڵـە حەفتا و دوو (٧٢) جار کەمتر و زیاتر لە خولەکێکدا لێدەدات، یـانی: لـە هەر خولەکێکدا دڵ (٧٢) جار خوێن دەگەێنێت بە هەموو خانەکانی لـەش و دەشـیهێنێتەوە، خـواردنی پاکیـان دەگەیـەنێتێ و دەشـیهێنێتەوەو، پاشەڕۆکی پیس دەرداوێتو فڕێی دەدات.

بۆیەش خوا (سبحانه و تعالى) لە قورئاندا زۆر سەرنجی ئێمە ڕادەکێشێ بۆ خۆمان و بۆ دەوروبەرمانو، دەفەرموێ: ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴾ (الذاريات- ٢١)، واتە: لە خۆتاندا (نیشانەی زۆر هەن لەسەر پەروەردەگاریێتیی خوا) بۆچی سەرنج نادەن و لە خۆتان وردنابنەوە!!

دیسان دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ۝٥٣ ﴾ (فصلت- ٥٣)، واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین لەئاسۆیەکاندا و لە دەروونی خۆشیاندا، تاکو بۆیان دەرکەوێ، کە خوا (سبحانه و تعالى) یاخود قورئان، حەقە.

## ٤-ژیان لە سایەی ئیماندا چۆنە؟!

یانی: ئەگەر ئینسان بە ئیمانەوە بژی، چی دەست دەکەوێت؟ بەپێچەوانەوەش: مرۆڤ ئەگەر بێ ئیمان بێت، چ زەرەرێك دەکات؟

با تەماشایەکی چەند ئایاتێکی قورئان بکەین:

١- لە سوورەتی (یونس) لە ئایەتی ژمارە (١٩)دا، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡ ﴾ (یونس- ١٩) واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، خوا بە هۆی ئیمانەکەیانەوە ڕێنماییان دەکات، ڕێیان پیشان دەدات، واتە: ئێمە دوای ئەوەی بە خواوە پەیوەست دەبین، دەزانین، کە خوا خاوەنمانەو، پەروەردگارو مشوور خۆرمانەو خوا ئێمەی بۆ

ئەم سەرزەمینە هێناوەو، بۆ حیکمەتێك ئێمەی دروستکردوە، دوایی ئێمە لەم قۆناغەی ژیانی دنیا دەگوازێتەوە بۆ قۆناغێکی دی، دوای ئەوەی لەو ڕاستییە حاڵی دەبین و، بە خواوە پەیوەست دەبین، ئنجا لە بوونی خۆمان حاڵی دەبین و، لە مەحەللی ئیعرابی خۆمان تێدەگەین، کە ئایا ئێمە بۆچی لێرەین؟! ئەگەرنا، کەسێك خوا نەناسێ، خۆی نەناسێ، نازانێ بۆچی هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟! ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی، هەمووی تاریکاییە، کەواتە: ئیمان دەبێتە هۆی ئەوە، کە تۆ بەر پێی خۆت ببینیو، بزانی بۆچی دەژی و چۆن دەژی؟!

٢- لە سووڕەتی (النحل)دا خوا(سبحانە و تعالی) دەفەرموێ:﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ (النحل- ٩٧).

شایانی باسە لە بواری دینداریی و بۆ خوا سوڵحان و ئیمان و طاعەتدا، فەرقی نێرو مێ نیە و، وەك یەكن و، تەماشای خودی مرۆڤ دەكرێ، نەك ڕەگەزەكەی، واتە: هەركەسێك كردەوەی باش بكات، لە نێر و مێ و بڕواداریش بێت، (لە دنیادا) بە ژیانێكی پاك و چاك دەیژێنینو، (لە ڕۆژی دووایيدا) بەپێی باشترین كردەوەیان پاداشتیان دەدەینەوە.

(طيِّب) واتە: ئەو شتە، هەم چاك بێ، هەم پاك بێ، ئنجا باسەرنج بدەین: چۆن مرۆڤ بەهۆی ئیمانەوە ژیانێكی پاك و چاكی دنیایی دەست دەكەوێ؟! ئینسان بە هۆی ئیمانەوە، پێش ئەوەی زانست بەرەو پێشەوە بچێ و بڵێ: فلان شتە زیانی هەیە، ئەوە مەخۆ، ئەوە مەكە، بەهۆی

ئیمانەوە لە هەموو ئەو شتە زیانبەخشانە دوور دەبێت، بۆ نموونە: ئێستا کە زانست بەرەو پێش چووە، دەرکەوتوە کە ماددە سەرخۆشکەرەکان، چ زیانێکیان هەیە؟! گۆشتی بەراز چ زیانێکی هەیە؟! هەروەها نێربازیی و زینا، قومار، بەهەموو شێوەکانیەوە، ئنجا جگەرە کێشان ... هتد، هەموو ئەو شتانەی، کە خوا قەدەغەی کردوون، بە هۆی ئیمانەوە، مسوڵمانان خۆیانیان لێ بەدوور گرتوون، چەندان جیل لە موسڵمانان هاتوون، خۆیان لە قەدەغەکراوەکان بەدوور گرتوە، بەبێ ئەوەی بۆیان دەربکەوێ زیانەکەیان چییە و چۆنە؟

هەروەها ئەو شتانەی کە باشن، بۆ نموونە: نوێژ، ئێستا لێکۆڵینەوەی دوورو درێژ هەیە دەربارەی نوێژ و حیکمەت و سوودەکانی نوێژ:

١- لە ڕووی وەرزشی جەستەییەوە.

٢- لە ڕووی تەرکیزی عەقڵییەوە.

٣- لە ڕووی ئۆخژن و ئارامیی دڵ و دەروونەوە.

٤- لە ڕووی جوانبوونی ئەخلاقەوە.

هەروەها ڕۆژوو و عیبادەتەکانی دی، دوای ئەوەی، کە زانست بەرەو پێشەوە چووە، ئەو شتانە سوود و حیکمەتەکانیان زانراون، بەڵێ، پێش ئەوەی خەڵك نهێنیی و حیکمەتەکانیش بزانێ، بەهۆی ئیمانەوە، ئەرکە شەرعییەکانی هەر جێبەجێکردوون و، خۆی لە قەدەغەکراوەکان پاراستوە، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: هەرکەسێك ئیمانی هەبێت، لە نێرو مێ، وەکردەوەی باش بکات، بە ژیانێکی چاك و پاك دەیژێنین، یانی: ئینسانی

ئیماندار، دوورە لەو نەخۆشییانەی، کە لە گوناحان پەیدا دەبن، دوورە لەو حاڵەتە دەروون تێکچوونانەی، کە لە ئەنجامی دڵە ڕاوکە و، خوانەناسیی و، دوور لە خوایی و، پشت بەخوا نەبەستن، پەیدا دەبن، ئینسان مەخلوقێکە پێویستی بەوە هەیە لە پەنای خوادا بژی، پێویستی بەوە هەیە، پشتی بەخواوە بێ، پێویستی بەوە هەیە، بزانێ کە مشوور خۆرێکی هەیە، ئاگای لێیەتی و سەرپەرشتیی دەکات.

٣- لە سووڕەتی (الأنعام)دا، خوای پەروەردگار ئاوا بۆمان وێنا دەکات، کە ئیمان چ ڕۆڵێك دەبینێ، لە ژیانی مرۆڤدا، دەفەرموێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾ (الأنعام- ١٢٢)، واتە: ئایا کەسێك، کەمردوو بوو زیندوومان کردەوەو ڕۆشنایییەکمان پێدا لە نێو خەڵکیدا پێی بڕوا، وەك کەسێك وایە، کە لەتاریکاییان دایە و لێیان دەرباز نابێ؟

ئینسانی ئیماندارو هی بێ ئیمان، زیندوو لەگەڵ مردوو چەندە جیاوازن، ئینسانی ئیمانداریش لەگەڵ بێ ئیماندا، ئەوەندە جیاوازن، بێگومان کەسێك، کە لەبەر ڕۆشناییدا بەڕێوە دەچێت، زۆر جیایە لەوەی، کە لەتارییکاییان دایە و، بەر پێی خۆی نابینێ، ئینسان بە هۆی ئیمانەوە زیندوو دەبێت، ڕووحێکی زیندووی دەبێت، دڵ و دەروونێکی زیندووی دەبێت، بەهۆی ئیمانەوە، ئینسان بەر پێی خۆی دەبینێ، حەڵاڵ و حەڕام، چاك و خراپ، دۆست و دوژمن، لێك جیادەکاتەوە، ئەوە ئیمانە پێت دەڵێ: ئەوە مەکە، چونکە زیانی هەیەو ئەوە ئەنجام بدە، چونکە بۆ دنیا و

دوارِۆژت چاکە، بەهۆی ئیمانەوە ئینسان وەك گوتم: دەستی لە هەموو خێر و چاکەیەك گیر دەبیٚ و لە هەموو شەڕو خراپەیەکیش دوور دەبیٚ و دەپارێزریٚ.

## ٥- بەرهەمی ئیمان لەژیانی تاك و کۆمەڵدا:

١ـ لەڕووی عەقڵییەوە: عەقڵی ئینسان هەمیشە لەبیرکردنەوە دایە، دەبیٚ چەقێك هەبێت ئەو عەقڵە پشتی پیٚ ببەستیٚ، ئەگەر نا، هەر ڕۆژە قسەیەك دەکات، ئەوەتا ئەوانەی ئەهلی فیکرو ئەهلی سیاسەتن، ئەگەر پشت بە سەرچاوەی وەحی و زانیاریی‌و حیکمەتی بیٚسنووری خوا ببەستن، هەر ڕۆژە قسەیەك ناکەن، هەر ڕۆژە هەڵوێستێك نانوێنن، بەڵکو چەسپاوو دامەزراو دەبن، بەڵام ئەوەی دیکە، وەك گوڵە بەڕۆژەیە، هەر ڕۆژە ڕوو لەلایەك دەکات و، هەرجارە غەریزەی، بۆچوون و بیروڕای، سۆزو عاتیفەی، بەلایەکدا دەیبات، کەواتە: لە ڕووی عەقڵییەوە، ئینسان بە هۆی ئیمانەوە، دامەزراو دەبێت.

٢ـ لە ڕووی فیطریی و دڵ و دەروونەوە: ئەو ئۆخژن و ئارامییەی بەهۆی ئیمان و پەیوەندیی لەگەڵ خوا دا، ئینسان دەستی دەکەوێت، بە هۆی هیچ شتێکی دیکەوە دەستی ناکەوێت، لە ڕۆژئاوا، لە وڵاتانی وەك: سوید و نەرویج و ئەمریکا، کە ژیان و گوزەران لە ڕووی ماددییەوە، زۆر تێیاندا پێشکەوتوویە، خەڵك لەسەر هیچ پەکی نەکەوتوە، کەچی

خۆکوشتن(إنتحار) هەیە، بۆچی؟ چونکە ئەو مرۆڤە لە ڕووی ڕوحییەوە، هەست دەکات برسیی و تینوویە، بەڵام بە هۆی ئیمان و خواناسییەوە، ئینسان تێر (إشباع) دەبێت، دڵ و دەروونی ئاسوودەیی و تەسەللای بۆ دێ، ئەگەرنا وەك پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

تەماع وەك ئاوی سوێری دەریایە هەر دەیخۆیتەوە و تەسەللات نایە.

ئەوەی بە تەما بێ، بەهۆی شتە مادیییەکانەوە، بەهۆی خانووبەرەی باش‌و، کەل و پەل و سەیارەی چاك و، پارەی زۆرەوە، ڕووحی تێر(إشباع) بێ، بە هەڵەدا چووە، ئەو ڕووحە تەنیاو تەنیا بەو شتە تێر دەبێ، کە لەلای خواوە دێت، چونکە ڕووح دروستکراوێکی تایبەتی خوایە: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾ (الإسراء- ٨٥)، واتە: دەربارەی ڕووح پرسیارت لێدەکەن، بڵێ: ڕووح پەیوەندیی بە فەرمانی پەروەردگارمەوە هەیە. یانی: ڕووح لە عالەمی خەلق نیە، لە عالەمی ئەمرەو بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا دروست بووە، ئایا ئەو ڕووحە بە چی شاد دەبێ؟ بەچی ئۆخژنی دێت؟ بەچی ئارام دەبێ؟﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ (الرعد-٢٨) واتە: ئاگاداربن! تەنیا بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن، ئۆخژنیان دێت، ئاسودەییان بۆ دێ، بە هیچ شتێکی دیکە، ئەو ئۆخژن و ئارامییە بۆ دڵ پەیدا نابێ.

٣ـ <u>لە ڕووی ڕەوشتەوە</u>: ئینسان ئەگەر لە سایەی ئیماندا بژی، ئەو ئیمانە، ڕەوشتە جوانەکانی بۆ دیاریی دەکاو پێی دەڕازێنێتەوە، ئەوەی کە

ئـەهلی تەزکییـەو عیرفـان دەڵـێن: (التحليـة بالفضـائل، والتخليـة مـن الرذائل)، واتە: ڕازانەوە بە سیفەتە پەسندەکان و، خۆ بژارکردن لە سـیفەتە نزم و پەستەکان، ئەوە تەنیا لە سایەی ئیمانداو، بـەهۆی خـوا پەرسـتییەوە دێتە دی.

لەسەرەتای سووڕەتی (المؤمنون)ـدا خوا دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ﴿٤﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١١﴾﴾ (المؤمنون- ١-١١). وەك دەبینین خوای کار بە جێ هەرکام لە سیفەتەکانی:

١- گەردنکەچیی لە نوێژدا.

٢- پشت کردنە قسەو ڕەفتاری پووچ.

٣- زەکات دان و ماڵ و سامان بەخشین، یان خۆ تەزکیە کردن.

٤- داوێنی خۆ پاراستن لە قەدەغە.

٥- پاراستنی سپاردەو پەیمان و بەڵێن.

٦- پارێزگاریی کردن لە نوێژەکان.

دەکاتە پێناسەی بڕواداران (مؤمنون)، یانی: ئەو خەسڵەتە گەورە و گرنگانە زادە و بەرهەم و شوێنەواری ئیمانن.

لە کۆتایی سووڕەتی (الفرقان)یشدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ ﴾ الفرقان.

لێرەشدا خوا پازدە (١٥) سیفەتان دەژمێرێ، کە بە هۆی ئیمانەوە دێنە دی، کە ئەمانەن:

١ـ بە ئارامیی و ویقارەوە بە ڕێدا ڕۆیشتن.

٢ـ قسەی بە نەزاکەت و بە حورمەت لەگەڵ نەفامماندا کردن.

٣ـ شەوگار بەسەر بردن لە خزمەت پەروەردگاریاندا، بە کڕنووش بردن و ڕاوەستانەوە لە نوێژدا.

٤ـ لە خوا پاڕانەوە، کە لە ئاگری دۆزەخ چەپاڵەیان بدات.

٥ـ خۆپارستن لە زێدەڕۆیی و ڕژدیی، لە ماڵ و سامان و بەخشیندا.

٦ـ لەگەڵ خوادا، هیچ پەرستراوێکی دیکە پەیدا نەکردن و لێ نەپاڕانەوەی.

٧ـ نەکوشتنی نەفسێك، کە خوا قەدەغەی کردوە، مەگەر بە هەقی خۆی بێت.

٨ـ زینا نەکردن.

٩ و ١٠ـ گەڕانەوە بۆ لای خوا و، کردەوەی چاکە کردن.

١١ و ١٢ـ ئامادە نەبوون لە کۆڕ و مەجلیسی گوناهو درۆ و دەلەسەداو، بە ڕێز و حورمەتەوە ڕەت بوون، بە لای قسە و کرداری پووچ دا.

١٣ـ کەڕ و کوێرانە مامەڵە نەکردن لەگەڵ ئایاتەکانی خوادا، لەکاتی بیرخرانەوەیاندا.

١٤ـ و ١٥ـ لە خوا پاڕانەوە، کە هاوسەر و وەچەیان بۆ بکاتە مایەی دڵخۆشیی و چاو گەشیی دنیا و دواڕۆژ و، خۆشیان بگێڕێ بەپێشەوای پارێزکاران.

بەڵێ، بە هۆی ئیمانەوە، مرۆڤ دەستی لە هەموو ڕەوشتێکی بەرز و پەسند گیر دەبێو، دەتوانێ خۆیشیان پێبڕازێنێتەوەو، دەتوانێ خۆی کۆنترۆڵ بکات: غەریزەکانی خۆی، عاتیفەی خۆی، جەستەی خۆی، کۆنترۆڵ بکات، خۆی لە هەر ڕەوشتێکی دزێو و خراپ بە دوور بگرێ.

٤ـ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە: کۆمەڵگایەك، کە لە سایەی ئیماندا بژی، پێکهاتەکانی ئەو کۆمەڵگایە، بەرپرسەکان، خەڵکی دیکە، ڕۆشنبیر و خوێندەوارەکان و خەڵکی سادە و عەوام، پیاوان و ئافرەتان، پیران و گەنجان، هەموو پێکهاتەکان، لەسەر بناغەی ڕێز و ڕەحم، پێکەوە مامەڵە دەکەن، زۆر جاران گوتوومە: جاری وایە کەسێکی ئیسلامیی، بەوە هەستیارە، کە ئافرەتێکی سەر ڕووت ببینێ، سەرپۆشی لەسەر نەبێ، یاخود گەنجێ ببینێ، شەڕاب بخواتەوە، باشە ئەوە دوانە هەردووکیان گوناحن، ئافرەت دەبێ پۆشتە بێ، وە ئینسان دەبێ خۆی لە ماددە سەرخۆشکەرەکان بە دوور بگرێ، بەڵام ئایا هەر ئەوانە گوناحن؟ ئێمە زۆر جاران لە ئەنجامی بچووك تێگەیشتنمان بۆ ئیسلام، هەستیارییمان نیە بۆ زۆر جۆرە گوناح، کە زۆر لەوانە گەورەترن، بۆ نموونە: ئەو گەندەڵیی و قۆرخکارییەی لەم هەرێمەدا دەکرێ، ئەو موڵك و ماڵی وڵات دەست

بەسەرداگرتنە، ئەو خێرو بێری ئەم وڵاتە فرۆشتنە، بەبێ ئەوەی، کە حیسابێکی ڕوونی دیار بێ، بەبێ ئەوەی، کە خەڵکەکە لە خێرەکەی خۆیان بەهرەمەندبن، ئەوە دەزانن چ تاوانێکە؟!، خوا لە قورئاندا تەنیا بۆ زاڵمان فەرموویەتی:﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (هود- ١٨) واتە: ئاگاداربن! نەفرینی خوا لە زاڵمان، چونکە زوڵم هەموو کۆمەڵگا تێکدەدا، کەسێك گوناحێك دەکا، گوناحەکە زیانی بەس بۆ خۆیەتی (ئەگەر لەو گوناحە تایبەتییانە بێت)، بەڵام زوڵم گوناحێکی گشتییە.

لێرەدا دەپرسین: ئایا دەتوانین بڵێین: ئێمە ئێستا کۆمەڵگایەکی ئیماندارو باشین؟ لەسایەی ئیماندا دەژین؟ ئەگەر لە سایەی ئیماندا دەژین، کوا ڕەحممان بەرامبەر بەیەکدی؟ کوا هاوسۆزییمان؟ کوا بەتەنگ یەکدییەوە بووغمان؟ ئەوەی کە حیزب و خزم پڕ دەکات و، دەیکاتە ملیاردێر، بەڵام لە خەڵکی دیکەوە ڕادەمێنێ: ڕووت و ڕەجاڵ و بێ نوا و بەرگ بێ؟، ئەوە مانای وایە لە سایەی ئیماندا ناژی.

٥ـ لە ڕووی ئابووریی و گوزەرانەوە: ئەگەر ئێمە ئەهلی ئیمان بین، دەزانین خوا ئەو نیعمەتانە، کە داینـاون، بۆ هەموانی داناون، کەس لەکەسی زیاتری بەش پێوە نین، بۆ زانیارییتان! قڕیی و پڕیی و چینایەتیی، ناگونجێ لە کۆمەڵگایەکی ئیمانداردا ببێ، ئەوەی کە ئێستا هەیە لەسایەی سیستمی سەرمایەداریی (کاپیتالیستی)ـدا، کە دنیای داگیر کردوە، سەدو هەشتا (١٨٠) پلە، لەگەڵ ئیسلامدا پێچەوانەیە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴾ (الرحمن- ١٠) واتە: خوا زەوی داناوە بۆ خەڵك، نەیفەرمووە: بەس بۆ دەوڵەمەندەکان، بـ ملیاردێرەکان !

هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا ﴾ (البقرة- ٢٩) واتە: خوا ئەو کەسەیە، کە هەرچی دروستیکردوە لە زەویدا، بۆ هەموانتانی دروست کردوە، نەیفەرمووە: بۆ هەندێکتان و، دوایی بەخێر بیدەن بە هەندێك لەوانی دیکە، لە بەرامبەر ئەوەدا، کە ئازادیی و ئیرادەیانی پێ دەکڕن!.

٦ـ لە ڕووی سیاسییەوە: ئایا کۆمەڵگایەك لە سایەی ئیماندا بێت، بەو شێوەیەی ئێستامان دەبێت؟! کە هێندێکی بەچاوی کۆیلە تەماشای ئەوانی دیکە بکات!!. بێگومان نەخێر، چونکە: بناغەی حوکمڕانیی و سیاسەت لە ئیسلامدا، بریتیە لە ئیمان و خوا بەیەکگرتن، (توحید) یانی: تەنیا خوا پەرستراوەو، خەڵك دەبێ هەمووی وەك یەك بێ لە بەرانبەریدا، هەمووی دەبێ بەندە و فەرمانبەری خوا بێ.

کەواتە: بە چ حەقێك دەبێ یەکێکیان تەماشای ئەوانی دیکە بکات، بەچاوی کۆیلە و خزمەتکار؟! پێی وابێ لەسەریان فەرزە خزمەتی وی بکەن، بەڵام ئەو هیچ ئەرکێکی لەسەر شان نیە؟!.

٧ـ له ڕووی نەتەوەو نیشتیمانەوە: ئەگەر ئێمە لەسایەی ئیماندا بژین، نیشتیمانی خۆمان خۆشدەوێ، نەتەوەی خۆمان خۆشدەوێ، بەبێ جیاوازیی، هەیە تەنیا شارێکی خۆشدەوێ، یان دەڤەرێکی خۆشدەوێ، شار و دەڤەرەکەی دیکە ئاو بیبات، باکی نیە! ئایا ئەوە نیشتیمان پەروەرییە؟!

ئایا ئەوە نەتەوە پەروەرییە؟!

بگره لەوەش خراپتر: هی وا هەیە تەنیا ئەوانەی، کە بۆ حیزبەکەی خۆی ئینتیمایان هەیە، خۆشیدەوێن و، تەنیا بە تەنگ ئەوانەوەیە، ئایا ئەوە نیشتیمان پەروەریی و نەتەوە پەروەرییە؟!

ئەدی ئەوی دیکەش هەر کورد نیە؟!

ئەوی دیکەش هەر لەسەر ئەو نیشتیمانە ناژی؟!

ئەدی ئەویش برا و خوشکی تۆ نیە، لە ڕووی نەسەب و ڕەچەڵەکەوە؟!

کەواتە: بە ڕاستیی لە سایەی ئیماندا، ژیان لەسەر سەرتاپای ژیانی ئینسان، لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵگا و قەوارەی سیاسی، شوێنەواری ئیجابیی دادەنێت، هەر وەك پێچەوانەی ئیمانیش: بەباری سەلبییدا شوێنەواری زۆر خراپ و شووم، لە ژیانی تاك و خێزان و کۆمەڵگادا بەجێ دەهێڵێ.

**چوار ئاگاداریی، وەك پێشدەستیی:**

یەكەم:

خوا (سبحانە و تعالی) نەیویستوە مرۆڤ ناچاربكات، ئیمان بێنێ، وەك لە ئایەتی ژمارە (٩٩ ) لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ:﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ..... ﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، تێكڕای خەڵكی سەر زەوی ئیمانیان دەهێنا.

ئەوەتا فریشتەكان هیچیان لە فەرمانی خوا دەرناچن، خوا، ئەگەر ویستبای مرۆڤەكانیشی وا لێدەكردن، بەڵام ویستوویەتی مرۆڤ ئازاد بێت، بۆ خۆی بە ئیرادەی خۆی ئیمان بێنێ، یان نەیهێنێ.

دووەم:

خراپ تێگەیشتن لە ئایین، خەڵك هاندەدا بەرەو ئیلحاد، لە ڕۆژئاوا دوای ئەوەی ئایینی نەصرانیی بەدەست پیاوانی كەنیسەوە (چینی ئەكلیرۆس) بوو بەوەسیلەیەك بۆ چەوساندنەوەی خەڵك، كە لەڕۆژئاوا سێكوچكەیەكی شووم دروست بوو: (پاپا و پادشا و دەرەبەگ (إقطاع))، ئەو سێكوچكە شوومە، كەوتنە وێزە و گیانی خەڵك، واتە: پاپا كە سەرپەرشتیی دینی دەكرد، یەكێك بوو لەو سێ پایەی كە خەڵك و جەماوەریان وەزاقە زاق خستبوو: مافەكانی خەڵكیان پێشێلدەكرد،

خەڵکیان دەچەوساندەوە، خەڵکەکەش وایانزانی دین تەنیا نەصرانییەتە، ئەویش تێکدرابوو، بۆیە ڕێی ئیلحادیان گرتەبەر، تاکو بە یەکجاریی لەدین دەربازیان بێ و، لە پیاوانی دین دەربازیان بێ، ئنجا کە خەڵکی ڕۆژئاوا ڕوویان کردە سیکۆلاریزم (عەلمانییەت) ئەوە نهێنییەکەیەتی، خەڵکی ڕۆژئاوا ئاینێکی ڕاست و دروست (صحیح)ی لەبەر دەستدا نەبوو، تاکو بڵێ:

١- بۆ ئەوەی لە ڕووی زانستییەوە بەرەو پێش بچم.

٢- بۆ ئەوەی جەماوەر ئازاد بێت.

٣- بۆ ئەوەی دادگەریی بچەسپێ.

٤- بۆ ئەوەی دەستی زاڵم بگرم.

پێویستییم بەوە نیە، ڕوو لە سیکۆلاریزم بکەم، یەکم لەسەر ئەوە نەکەوتوە، پشت لە خوا و ئایین و بەرنامەکەی بکەم، چونکە هەموو ئەو ئامانجانە و زۆری دیکەش، ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروستی خوا (ئیسلام)، هەموویان دەستەبەر دەکات.

<u>سێیەم:</u>

کەسێك بیەوێ ئیمان نەهێنێ، ڕێ لە بیانووی ناگیرێ، یانی خوا (سبحانه و تعالى) دەیتوانی کارێکی وابکات هەموو کەسێك خوا ببینێ، فریشتەکان ببینێ، دۆزەخ و بەهەشتان ببینێ، بەڵام وای نەکردوە، تاکو ئینسان ئەگەر ئیمانی هێنا، ئازایەتیی ئینسانی تێدا دەربکەوێ، وەئەگەر ئیمانیشی نەهێنا، مەجالێکی هەبێ، چونکە دنیا جێی تاقیکردنەوەیە،

هەر بۆیەش لە دوا ڕۆژدا کەس کێشـەی ئیلحـاد و ئیمـان هێنـان و ئیمـان نـەهێنانی نیـە، وەك خـوای زاڵـی زانـا لـە سـوورەتی (ق) دا دەفـەرموێ: ﴿ لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴿٢٢﴾ ﴾ (ق-٢٢) خوا لەسەر زمانی فریشتەکان بە ئینسانی بێبڕوا دەفـەرموێ: تـۆ بـێ ئاگابووی لەم واقیعە، ئنجا پەردەمان لەسەر (چاوت) لادا، ئێسـتا چـاوت زۆر چاك دەبینێ.

هەموو کەس لە سەرەمەرگدا لە خۆی حاڵی دەبێ، دەڵێ: دیارە ئـەوەی دەیانگوت: خوا هەیە و، فریشتە هەن و، قیامەت هەیە، ڕاسـت بـوو، مـن بەهەڵەدا چووبووم، بۆیە خوای پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا ﴾، بەڵام لە دنیادا خوای بەرز و مەزن بـە جۆرێـك لـە پـەردەپۆش، خۆی پەردەپۆش کردوە، بۆ ئەوەی خەڵك بتوانـێ ئیمـان نـەهێنێ، ئەگـەرنا ئەگەر خوای بەرز و مـەزن ببینرابایـە، ئـەو کاتـە ئیمـان هێنـان ئیجبـاریی دەبوو.

چوارەم:

عـەقڵی مرۆڤ سنوردارە، ئینسان نابێ بـە تـەمابێ بـە عـەقڵی، هـەموو شتێك دەرك بکا، بۆیە خوا (سـبحانە و تعـالی) ئێمـەی لـەم سـەر زەوییـە داناوە، تاکو تاقییمان بکاتەوە، ڕەنگە زۆر لە نهێنییەکانی دین و ژیـن بـۆ ئێمە کەشف نەبن، لەبەرئەوەی لە توانـای عـەقڵدا نـین، هەڵبەتـە بـەردەوام نهێنییـەکان بـۆ ئێمـە دەردەکـەون، بـەڵام هـەر چـۆن بـێ، نابـێ ئینسـان کەڵکەڵەی ئەوەی لـە کەللـەدا بـێ، کـە بـە عـەقڵی خـۆی هـەموو شـتێك

بزانێو، هەر شتێك نەیزانێ و، هەر شتێك لە عەقڵی ئەودا جێی نەبۆوە، بڵێ: نیە، بۆیە زانایان بنچینەیەکیان داناوە، زانایانی لۆژیك (منطق) دەڵێن: (عَدَمُ العِلمِ لا يستلْزِمُ عِلْمَ العَدَمِ) واتە: زانیاریی نەبوون بە شتێك، بەڵگەی ئەوە نیە، کە ئەو شتە نیە، ساڵەهای ساڵ، ڤایرۆس و میکرۆب هەر هەبوون، بەڵام مرۆڤ پەی پێ نەبرد بوون، هەتا (لویس باستۆر) لەسەدەی نۆزدەدا، ئەو جیهازی میکرۆسکۆب (زەڕەبین)ی بۆ دروست کردین، ئنجا بۆمان دەرکەوت، کە زیندەوەری زۆر ورد هەن، دیارە پێشتریش هەر هەبوون، بەڵام مرۆڤ نەیتوانیبوو بیانبینێ، ئنجا بەهەشت و دۆزەخیش هەن، جینن و فریشتەکانیش هەر هەن، بەڵام تۆ ناتوانی بیانبینی، هەروەك چۆن هێزی کێشندە(جاذبية) هەر هەبووە، پێش ئەوەی ئیسحاق نیۆتنیش لە سەدەی حەڤدەی زایینیدا بیدۆزێتەوە، ناکرێ بڵێین: تاکو ئیسحاق نیوتن هێزی کێشندەی نەدۆزیبۆوە، ئەو هێزە نەبووە! هەر هەبووە، بەس خەڵك نەیدەزانی کە هەیە و، پەییان پێ نەبرد بوو.

## ڕەواندنەوەی گومانەکان:

### ١- دەربارەی خوا (عزّ وجل):

گومانی یەکەم:

لە بارەی بەرهەست (محسوس) نەبوونی خواوە (سبحانه و تعالى)، یەکێك دەپرسێ دەڵێ: من شتێك، کە نەتوانم بە پێنج هەستەکانم دەرکی بکەم، چۆن بڕوای پێ بێنم؟ مادام نەتوانم دەستی لێ بدەم، تامی بکەم، بۆنی بکەم، بیبینم، بیبیستم؟!

دەڵێین: بەڕاستی ئەوە عادەتێکی منداڵانەیە: منداڵ ئەگەر بابی، یان دایکی بچێتە بازاڕ، بڵێ: ڕۆڵە شتی جوانم بۆ هێناوی، یان شتێکی خۆشم بۆ هێناوی، دەڵێ: کوا؟ ئەگەر بڵێی هەڵم گرتوە، دەڵێ: نا، هەتا پێشانی نەدەی، بڕوا ناکا، دەبێ بە چاوی سەر بیبینێ، بەڵام مرۆڤی عەقڵ کامڵ وانالێ، مادام متمانەی هەبوو، دەڵێ: با نەی بینم، دیارە باب و دایکم ڕاست دەکەن!، ئنجا بەڕاستیی ئەوە عادەتێکی منداڵانەیە، تۆ بڵێی: شتێك تاکو من بە پێنج هەستەکانم مامەڵەی لەگەڵدا نەکەم، دانی پێدا ناهێنم، چونکە ئەگەر وابێ، ئەدی کوا هێزی کێشندە (جاذبیة)؟ کە هەموو بوون (وجود)ـی ڕاگرتوە (بە پێی زانیاریی ئێمە) وەك خوای زانا و توانا ئاسمانەکانی پێدەکات: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾

(الرعد- ٢)، واتە: خوایەك کە ئاسمانەکانی بەچەند کۆڵەگەیەك ڕاگرتـوون، کە ئێوە نایانبینن.

کە مەبەستی پێی هێزی کێشندە (جاذبیة)یە.

هەروەها کوا هێزی موگناتیسیی؟، دیسان کوا ئەو ڕووحەی کە هەموو وجوودی ئێمە بەو ڕووحەوە بەستراوە، بۆچی بە هیچ کام لە پێنج هەستەکان دەرکی ئەو ڕووحە ناکرێ؟ لە ڕاستییدا ئەم بوونە، خوای پەروەردگار دوو دیوی بۆ داناون: (پەنهان و ئاشکرا) وەك دەفەرموێ:﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ (الحاقة- ٣٨-٣٩)، واتە: نەخێر، {وەك ئێوە گومان دەبەن، ئەی بێ بڕوایەکان! وانیە} سوێند دەخۆم بەوەی، کە دەیبینن و بەوەش، کە نایبینن.

هەروەها خوا (عز وجل) فەرموویەتی:﴿ عَـٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ﴾ (الحشر- ٢٢) واتە: (خوا) زانای پەنهان و ئاشکرایە.

هـەر بۆیـەش زانایـانی کیمیـازان و، فیزیـازان و، گـەردوونزان دەڵـێن: زانست لە غەیبدا، هەتا بنانگوێی چەقیوە، بۆ وێنە: گەردیلە کە یەکـەمین خشتی دروستبوونی ماددەیە، هیچ کەس نەیبینیوە، بەس شـوێنەوارەکانی دەبینین، تەنانەت گەردیلەش هیچکەس هەموویشی نەبینیوە، چ جای سـێ پێکهاتە سەرەکییەکەی: (ئیلـیکترۆن و نـیترۆن و پرۆتـۆن)، هـیچ کەسـیش نکوولّیی ناکا لەوەدا کـە هەیـە، چـونکە شـوێنەوارەکانی دیـارن، کەواتـە: بەڵێ..! ئێمەش خوا (سبحانە و تعـالی) نـابینین، چـونکە ئەگـەر خوامـان

بینیبایە، ئەو کاتە بە کەڵکی تاقیکردنەوە نەدەهاتین لەسەر زەوی، خوا نابینین، بەڵام ناوەکانی خواو وە سیفەتەکانی خوا، لە دروستکراوەکانی خوادا دەدرەوشێنەوە، وەك یەکێك لە زانایان دەڵێ: (وَفِي كل شيء لە آية، تدلُّ على أنه واحد) واتە: لە هەموو شتێکدا نیشانە و بەڵگەی هەیە، لەسەر ئەوەی ئەو (خوا) یەکە[1].

گومانی دووەم:

ئەگەر ڕاستە خوا هەموو شتێکی دروستکردوە، ئەدی کێ خوای دروست کردوە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو پرسیارە لە سەردەمی پێغەمبەریشدا (عليه الصلاة والسلام) هەبووە، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (يأتي الشيطانُ أحَدَكم فيقول: مَن خلق كذا؟ مَن خلق كذا؟ حتى يقول: من خَلَق ربَّك؟ فإذا بلغه، فَلْيَستَعِذْ بالله و لْيَنْتَهِ). رواه البخاري: ٣٢٧٦.

واتە: شەیتان (وەك خوتخوتە کردن) دێتە لای یەکێکتان دەڵێ: کێ فلان شتەی دروستکردوە؟ کێ فلان شتەی دروستکردوە؟ هەتا دەڵێ: کێ پەروەردەگاریی دروستکردوە؟ ئنجا هەرکات گەیشتە ئەوە، با پەنا بەخوا

---

[1] -کاتی خۆی نووسەرێك لەژێر ناو و نیشانی: {وحدة الله تتراءى في وحدة خلقه، وقدرة الله تتراءى في بديع صنعه}دا، لەگۆڤاری (العربي) کوێتیدا، زنجیرە وتارێکی دڵگیری دەنووسی، مانای ناو و نیشانەکەش ئاوایە:
یەکتایی خوا لەیەکبوونی دروستکراوەکەیدا دەردەکەوێو، دەستەڵاتی خواش لەرێكو پێکیی وەدیهێنراویدا دەدرەوشێتەوە.

بگرێ و (بڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)) با چیدی لەسەری نەڕواتو واز بێنێ.

ئنجا بۆ زانیاریتان: لە بەهەڵە خستنە ڕووی پرسیارەکەوە، ئەو ئیشکالە سەرچاوە دەگرێ، دەبێ بڵێی: هەموو دروستکراوێك بەدیهێنەرێکی هەیە، نەك هەموو شتێك و هەموو مەوجوودێك، بەڵێ، هەر شتێك دروستکرابێ، دەبێ کەسێك دروستی کردبێ، بەلام ئەدی زاتێك، کە دروست نەکرابێ، وەك خوا دەفەرموێ:﴿ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴾[2]، (حدید ٣)، واتە: خوا یەکەمە و کۆتایە و، ئاشکرایە و پەنهانە.

بۆچی دەفەرموێ: یەکەمە؟ واتە: پێش خوا هیچ شتێکی دیکە نەبووە، خوا هەموو شتێکی هێناوەتە دی، ئنجا بۆ ئەوەی لە عەقڵی مرۆڤ نزیکی بخەینەوە، دەڵێین: ژمارە یەك (١) بێنە، سێ سفری بخە بەردەم: (١٠٠٠)، ئەو ژمارەی یەك (١)ـە، بەها دەداتە هەموویان، شەش سفری بخە بەردەم، دەبێتە ملیۆن: (١٠٠٠٠٠٠)، دوازدە سفری بخە بەردەم، دەبێتە تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)، یەکەکە لابەرە، سفرەکان (٠٠٠) دەبن بە هیچو هیچ بەهایان نیە، بەلام سفرەکان هەموویان، لابەرە یەك (١)ـەکە، بەهای خۆی هەر هەیە.

[2] ـ پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (أللّهم أنت الأول فليس قبلك شيء) رواه مسلم ٢٧١٣٠ـ واتە: خوایە! تۆ یەکەمی و هیچ شتێك پێش تۆ نەبووە.

ئنجا بە هەمان شێوەش خوا (سبحانە و تعالی) یەکەمە و سەرەتایە، وە بەهاشی بە هەموو شتەکانی دیکە داوە، هەر بۆیە کاتێ، کە هیچ کام لە شتەکان نامێنن، خوا هەر هەیە، بەڵام بەبێ خوا، نەدەگونجا هیچ شتێك هەبێت، (ولله المثل الأعلى)، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ٣﴾ (الحديد- ٣)، یانی: خوا یەکەمینە بێ سەرەتا و دەستپێكو دوایەمینە بێ کۆتایی و بڕانەوە، هەروەها ئاشکرایە بۆ کەسێك بە چاوی دڵ و عەقڵ بۆی بگەڕێ، بەڵام پەنهانە بۆ کەسێك بە چاوی سەر بۆی بگەڕێ، تۆ بە چاوی سەر، پێش ئەوەی خوا نەبینی، ڕووح و هێزی کێشندە و هێزی موگناتیسیی و تیشکی ژێر سوور و سەرووی وەنەوشەیی و گەردیلە نابینی، ئایا دەتوانی نکوڵییان لێ بکەی؟! نەخێر، ئەدی بۆچی دانیان پێدا دێنی؟ چونکە شوێنەواریان دیارە، ئەدی ئایا شوێنەواری خوا دیار نیە، بە خۆتەوە و بەو هەموو گەردوون و کائیناتەوە؟!!

گومانی سێیەم: ئەم گەردوونە، هەمووی سیستماتیکە و بە یاسا بەڕێوە دەچێ و یاسای هەیە، چ پێویستیی بە خوا هەیە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەمە وەك ئەوە وایە بڵێی: کاتژمێر (سعات) دیارە پاتری تێدایە، یان قوڕمیش کراوە، هیچ پێویست ناکات بڵێی: کەسێك دروستی کردوە؟ چونکە ئەوە دیارە، بەهۆی پاترییەکەیەوە دەگەڕێ، یان

بەهۆی ئەوەوە، کە قورمیش کراوە؟، دەگونجێ شتێك دروست بکرێ، کە هەر خۆی جوولەی خودیی (الحَرِكة الذاتية)ـی هەبێ!!، بەڵام بێگومان سیستماتیك بوونی بوونەوەر و، یاساداریی و ڕێك و پێك (مُنَظَّم) بوونی، بەڵگەیە لەسەر هەبوونی یاسا دانەر، بەڵام ئایا کێ ڕێکیخستوە؟ بەڵێ، ڕاستە بوونەوەر ڕێك و پێك و سیستماتیك و یاسادارە، بەڵام کێ ڕێکیخستوە بەم شێوەیە؟! چونکە لە بوونەوەردا وردەکارییەك و ڕێك و پێکیی و سیستمێك هەیە، کە زۆر جێی سەرسوڕمانە، با چەند نموونەیەك بێنینەوە:

١ـ ئەو بەرگە هەوایەی کە دەوری زەوی داوە، ئەو بەرگە هەوایە ڕێژەی لە سەدا حەفتا و هەشت (٧٨٪)ـی نایترۆجینەو، لە سەدا بیست و یەك (٢١٪)ـی ئۆکسجینەو، لە سەدا سفر و لە دەدا سێ (٠،٣٪)ی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، ئنجا ئەگەر نایترۆجین زیاتر بوایە، یان کەمتر بوایە، ژیان تێکدەچوو، وە ئەگەر ڕێژەی ئۆکسجین کەمتر بوایە، ئینسان هەناسەی بۆ نەدەدرا، یان زۆر بە زەحمەت دەبوو، وە ئەگەر زیاتر بوایە، یەك دەنکە شقارتەت هەڵکردبایە هەموو هەوا گڕی دەگرت، هەروەها ئەگەر دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، زیاتر بووایە، یان کەمتر بوایە، ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی تێکدەچوو، یان هەر نەدەبوو.

ئنجا ئەو دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەی، کە ئێمە لەگەڵ هەناسەدا دەریدەدەینەوە، خۆراکی ڕووەکە (لە کرداری ڕۆشنە پێکهاتندا) وەریدەگرێ، ڕووەك و دارو درەخت، ئەو دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە

خۆراکەکەیانە، ئەوەش کە ڕووەك و شیناورد، وەك پاشەڕۆك دەریدەدا، کە ئۆکسجینە، خۆراکی ئێمەیە، بۆیە هەرچەندە مرۆڤ لەسەر زەوی زۆربن، مادام ڕووەك و شیناوردیش هەبێ، دارو درەخت هەبێ، هاوسەنگیی لەبەینی یەکدا ڕادەگرن.

٢ـ خێرایی خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، بریتیە لە سی (٣٠)کم لە خولەك (دەقیقە)یێکدا، وە خێرایی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆر (شمس)دا بریتیە لە سی (٣٠)کم لە چرکەیەکدا، واتە: شەست هێندەی خێرایی خولانەوەی بە دەوری خۆیدایە، ئنجا هەرکام لەو دوو خێرایی یە ـ کە بە هۆی یەکەمینانەوە شەوگار و ڕۆژگار پەیدا دەبن و ، بە هۆی دووەمیانەوە چوار کەشەکان (الفصول الأربعة)ی ساڵ: هاوین ، پایز، زستان، بەهار، پەیدا دەبن ـ ئەگەر کەمتر، یان زیاتر بوونایە، ژیانی بەشەر لە سەر زەوی نەدەبوو، یان تێکدەچوو.

٣ـ مانگ (قمر) دەوری (٣٤٠٠٠٠)کم تاکو (٣٨٤٠٠٠) کم لە زەوییەوە دوورە، ئنجا پتەویی ئەو هێزە کێشندەیەی نێوان زەوی و مانگ، هێندەی پتەویی کێبڵێکی پۆڵایی یە بە ئەستوورایی (سُمْك)ی پەنجا (٥٠)کم، یانی: کێبڵێك کە تیرەکەی پەنجا کیلۆمەتر بێت!!

ئنجا ئەگەر گریمان مانگ بە دەوری زەوییەوە نەبوایە، زەوی لە جیاتی بیست و چوار (٢٤) سەعات، جارێك، هەر چوار سەعات، جارێك بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە، یانی: شەوگار و ڕۆژگار، یەکی دەبوونە دوو (٢) سەعات!!

وە ئەگەر دووریی مانگ لە زەوییەوە کەمتر، یان زیاتر بوایە، هەڵکشان و داکشان (مَدُّ و جَزْر)ی دەریاکان، کەم و زیادی دەکرد و، دیسان ژیانی بەشەر تێکدەچوو، یان هەر نەدەبوو.

هەڵبەتە من ناتوانم لێرەدا وێنەی زۆر لەو بارەوە بێنمەوە، بەڵام دەڵێین: هەبوونی یاساکان (قوانین) لە گەردوون دا، نەك ئێمە بێ ئیحتاج ناکات لە خوا، بەڵکو ناچارمان دەکات بڵێین: دەبێ کەسێك ئەو قانوونانەی دانابن و، کەسێك ئەو سیستمەی دانابێ.

گومانی چوارەم: ئایا خوا (عز وجل) بۆچی ئێمەی دروستکردوە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم پرسیارە زۆر لە مرۆڤ گەورەترە، چونکە خوا تەنیا ئێمەی دروست نەکردوە، ئەو بوون (وجود)ە پان و پۆڕەی دروستکردوە، کە زانایان تاکو ئێستا نازانن ئاسۆیەکانی و کۆتاییەکەی لە کوێیە؟ بەڵێ، خوا وێڕای مرۆڤ، گەلێك شتی دیکەشی دروست کردوە، ئنجا ئایا ئەو گەردوونە هەمووی هەر پەیوەستە بە ئێمەوە؟ بێگومان فریشتەکانیش هەن، جیننیش هەیە و، هەر خوا دەزانێ چەند دروستکراوی دیکەش هەن، ئێمە نایانزانین، خوای پەروەردگار لەو بارەوە، لە سوورەتی (کهف) لە ئایاتی (٥١)ـدا دەفەرموێ:﴿ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴿٥١﴾ ﴾ (الكهف- ٥١) واتە: نە لە دروستکرانی ئاسمان و زەویدا پرسم پێکردوون، (دروستیان بکەم، یان دروستیان نەکەم؟)، وە نە لە دروستکرانی خۆشیاندا.

ئێمه زۆر له‌وه بچووكترین، ئنجا ئینسان ئه‌گه‌ر نه‌بێ، خوا چۆن پرسی پێبكات؟ تۆ ئه‌گه‌ر نه‌بی، خوا چۆن پرست پێبكات؟، پاشان مرۆڤ زۆر له‌وه بچووكتره، بۆیه خوا له سووره‌تی (الأنبیاء)دا ده‌فه‌رمووێ: ﴿ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴾ (الأنبیاء- ٢٣)، واته: خوا پرسیاری لێناكرێ له‌وه‌ی، كه ده‌یكا، ئه‌وان پرسیاریان لێده‌كرێ.

چونكه خوا خاوه‌نی ئه‌وپه‌ڕی حیكمه‌ت و ئه‌وپه‌ڕی زانست و ئه‌وپه‌ڕی ڕه‌حمه‌ته و، هه‌موو سیفه‌ته‌كانی خوا بێسنوورن، خوا كاری بێ حیكمه‌ت ناكات، بۆیه ئه‌و پرسیاره له نه‌زانیی مرۆڤه‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێ، كه خوا بۆچی پرسی به من نه‌كردوه؟ ئاخر تۆ چی ئه‌ی مرۆڤ؟! تۆ به‌س زه‌ڕڕه‌یه‌كی له مولكی خوا!!

<u>گومانی پێنجه‌م</u>: خوا بۆچی به‌ندایه‌تیی كردن بۆ خۆی، له‌سه‌ر ئێمه پێویست كردوه، له حاڵێكدا پێویستی به خواپه‌رستیی ئێمه نیه؟

ده‌ڵێین: ئه‌وه ڕاسته خوا پێویستی به خوا په‌رستیی ئێمه نیه، خوا ده‌فه‌رموێ: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾ (فصلت- ٤٦)، واته: هه‌ر كه‌سێ چاكه بكا، (سووده‌كه‌ی ته‌نیا) بۆ خۆیه‌تی، وه هه‌ر كه‌س خراپه‌ش بكات، زیانه‌كه‌ی (به‌س) بۆ خۆیه‌تی، وه په‌روه‌ردگارت سته‌مكار نیه به‌رانبه‌ر به به‌نده‌كانی.

به‌ڵام ئایا بۆچی خوا: به‌ندایه‌تیی و تاعه‌ت و چاكه‌ی له‌سه‌ر ئێمه پێویست كردوه؟ وه‌ڵامه‌كه‌ی ئه‌وه‌یه، كه ئێمه پێویستییمان پێیه‌تی،

تەماشا بکەن: مرۆڤ ئەگەر خواناس و بڕوادار بێت، چەند ئازاد و ئازا دەبێت، ئەو بەندایەتییە کە بۆ خوا دەیکەی، کۆت و زنجیری دەست و پێت دەپچڕێنێ، نابی بە کۆیلەی کەس، بە درێژایی مێژوو، هەموو ئەو فیرعەون و نەمروود و تاغووتانەی خەڵکیان کردوە بە کۆیلە، لە ڕێی شیرك و کوفرو بێ دینییەوە بووە، چونکە ئەگەر خەڵك دارو بەردێکی پەرست، مانگ و خۆری پەرست، بابای خۆ بە پەرستراوو خۆ بە پەروەردگار زانیش دەڵێ: منیش بپەرستن، مادام دارو بەرد دەپەرستن!! بەڵام ئەگەر خەڵك خوای پەرست، پێی دەڵێن: ئنجا تۆ کێی؟! وەك مووسا (علیه السلام) بەفیرعەونی فەرموو، کە فیرعەون لێی پرسی: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴾ (طه- ٤٩)، واتە: گوتی: ئەی مووسا! پەروەردگاری ئێوە کێیە؟ ئەویش فەرمووی: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ (طه- ٥٠)، واتە: (مووسا) گوتی: پەروەردگاری ئێمە ئەو کەسەیە، بوونی بە هەموو شتێك داوە و ڕێنمایشیی کردوە، یانی: بوونیشی پێداوە و، بەرنامەشی بۆ داناوە، واتە: تۆ هیچ نی، هەر ئەو خوایە، کە بوون (وجود)ی بە هەموو شتێك داوە، لە نێویشیاندا تۆش، تەنیا ئەو شایستەی پەرستران و بەندایەتیی بۆ کرانە.

بەڵێ، بە ڕاستیی خوا: کە بەندایەتیی کردنی بۆ خۆی لەسەر ئێمە پێویست کردوە، خۆمان پێویستییمان پێیەتی، پێشێ بۆ ئەوەی، کە خۆمان یەکسان ببینین لەگەڵ یەکدا، کێ خۆی زۆر بەگەورە دەزانێ، لەم وجوودەدا، خۆمان لەگەڵ ئەودا بەیەکسان بزانین، ئەویش لەگەڵ خۆماندا

بە یەکسان بزانین، ئیمان و خوا بە یەکگرتن پێمان دەڵێ: کەس لە کەس گەورەتر نیە، هەمووومان پێکەوە بەندەی خواین، کەس لە کەس زیادیی نیە، کە ئەوەش ڕێ دەگرێ لە دروستبوونی فیرعەونەکان، چونکە فیرعەون بیرکردنەوەی ئاوابوو: ﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴾ (النازعات- ٢٤)، واتە: فیرعەون گوتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم.

هەروەها دەیگوت:﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي ﴾، (القصص- ٣٨) واتە: وە فیرعەون گوتی: ئەی دەست و پێوەندو مەجلیس و پیاو ماقووڵان! بێجگە لە خۆم، هیچ پەرستراوی دیکەم پێ شك نایەن بۆ ئێوە!

بەڵام ئەگەر ئیمان و تەنیا خوا پەرستیی، هەبێ، ڕێ لە شیرك دەگیرێ، ڕێ نادرێ بە کەس، پەروەردیگارێتیی و پەرستراوێتیی لەسەر خەڵك بکا.

پاشان ئەو عیبادەت و تاعەتە، ئێمە لە هەموو چاکەیەك نیزیك دەخاتەوە و، لە هەموو خراپەیەك دوورمان دەخاتەوە.

## ٢ـ دەربارەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):

<u>گومانی شەشەم</u>: کێ دەڵێ: موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) بۆ خۆی قورئانی دانەناوە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: سەد و یەك بەڵگە و هۆکار هەن، کە ناچارمان دەکەن بڵێین: قورئان لە خواوە بۆ (محمد)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (عبدالمطلب) دابەزێنراوە و، بۆ خۆی کەم و زۆر، دەستی تێیدا نەبووە،

هەروەها سەد و یەك كۆسپ و لەمپەر ڕێمان لێ دەگرن، كە بڵێین: (محمد) بۆ خۆی قورئانی فەرمووە، بەڵام لێرەدا دەرفەتی زۆرمان نیە و[٣]، تەنیا باسی یەك دیاردە دەكەین، كە لە یەك كاتدا:

١ـ هەم بەڵگەی لە خواوە دابەزێنرانی قورئانە بۆ سەر دڵی موبارەكی موحەممەد.

٢ــ هەم كۆسپ و لەمپەرێكی گەورەشە لە بەردەماندا، كە بڵێین: موحەممەد بۆ خۆی قورئانی داناوە.

ئەویش ئەوەیە، كە لە قورئاندا لە چەند شوێنان، ڕەخنە لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) گیراوە، ڕەخنەی زۆر هەستیاریش، بۆ نموونە:

١ـ دەربارەی ئەوە، كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) زەینەبی كچە پووری خۆی (زینب بنت جحش)ی مارە كردوە، خوا لێی مارە كرد و، پێشتر خێزانی زەید بوو، زەیدیش كۆیلەیەك بوو، كاتی خۆی، كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئازادی كردبوو، دوایی كردبووی بە كوڕی خۆی، وە پێش پێغەمبەرایەتیی، پێیان دەگوت: (زەیدی كوڕی موحەممەد)، ئنجا خوای كارزان بۆ ئەوەی ئەو عادەتە هەڵوەشێنێتەوە ــ واتە: عادەتی بە كوڕ كردن (التَّبنِّي)ــ، وای كرد، كە زەید زەینەب، دەست لێ

[٣] - لە هەركام لە بەرگی چوارەمی: (الإسلام كما يتجلى فی كتاب الله)دا، كە باسی ڕووەكانی ئیعجازی قورئانمان كردوە و ، بەرگی پێنجەمی دا، لە ژێر ناوونیشانی: (براهین نبوَّة خاتم النبیین)دا، ئەو بابەتەمان بە خەست و خۆڵیی توێژیوەتەوە، شایانی باسیشە: لە چاپی دووەمی: (موسوعة: الإسلام كما يتجلى فی كتاب الله)دا، ئەو دوو بەرگە، بوونەتە كتێبەكانی: پێنجەم و حەوتەم.

هەڵبگریّ، دوایی خوا فەرمانی بە پێغەمبەر کرد، فـەرمووی: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيۡدٞ مِّنۡهَا وَطَرٗا زَوَّجۡنَٰكَهَا ﴾ واتە: پاش ئەوەی زەیـد ئـارەزووی لیّ نـەما و پێویستیی پیّ نەما، زەینەبمان لە تۆ مارە کرد.

ئنجا پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) تەماشای عورف و عادەتی خەڵکی کرد، ئەو فەرمانەی زۆر لەسەر دڵی قورس بوو، بۆیـە خـوای کاربـەجیّ لـە سوورەتی (الأحزاب) دا ڕەخنەی لێگرت، فـەرمووی: ﴿ وَتُخۡفِي فِي نَفۡسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبۡدِيهِ ﴾(الأحزاب- ٣٧)، واتە: تۆ شتێکت لە دڵی خۆتدا شاردەوە، کە خوا ئاشکرای دەکات، (کە دەتزانی پاش دەست لیّ هەڵگرتنی زەید بـە هۆی بێزار بوونی و پێکەوە نەگونجانیانەوە، خوای زانا و شارەزا زەینەب لـە تۆ مارە دەکات).

دایکمان عائیشە (رضي الله عنها) دەڵیّ: ئەگەر پێغەمبەر (عليه الصلاة والسـلام) یەك شتی لە وەحی شاردبایەوە، ئەو ئایاتەی دەشاردەوە[٤]، چـونکە ئەوە ڕەخنەیەکی قورسە لە پێغەمبـەر (عليـه الصـلاة والسـلام)، چـونکە خـوا دوایی دەفەرمویّ: ﴿ وَتَخۡشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَىٰهُۖ ﴾ (الأحزاب- ٣٧) واتە: لە خەڵکی دەترسێی، لە حاڵێکدا خوا شایستەترە لێی بترسێی.

---

[٤]ـ المصباح المنير في تهـذيب تفسـير ابـن كـثير، ص ١٠٩١ـ ١٠٩٢ کـە ئـەمـە دەقـی قسەکەیەتی: (لو كَتَم محمدٌ شيئاً أوحي إليه من كتاب الله تعالى، لَكَتَم: ﴿ وَتُخۡفِي فِي نَفۡسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبۡدِيهِ وَتَخۡشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَىٰهُۖ ﴾ و قولـه تعـالى: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيۡدٞ مِّنۡهَا وَطَرٗا زَوَّجۡنَٰكَهَا ﴾.

یانی: مادام خوا دەفەرمویٚ: ئاوا بکە! دەبیٚ، ئاوا بکەی، پیٚت خۆش بیٚ و پیٚت ناخۆش بیٚ، تۆ پیٚغەمبەری خوای (علیه الصلاة والسلام) وەك چۆن بت و صەنەمەکان دەشکیٚنی، خوای کارزان دەیەویٚ عادەت و نەریٚتە نەفامییەکانیش هەر بە تۆ هەڵوەشیٚنیٚتەوە...[٥]

٢ـ جاریٚکیان پیاویٚکی کویٚر دیٚ بۆ خزمەت پیٚغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، ناوی (عبدالله بن أم مکتوم)بووە، (خوا لیٚی ڕازی بیٚت)، لەو کاتەدا پیٚغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) قسە دەکات بۆ کۆمەڵیٚك لەبەرپرسان و زلەزلانی قوڕەیش، دیارە (عبدالله) داوا دەکات چی قورئانی تازە هاتوە فیٚری بکات، پیٚغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) ڕووی لیٚ گرژ دەکا و دەفەرمویٚ: ئیٚستا سەرقاڵی قسە کردنم لەگەڵ ئەوانە، بڕۆ دوایی وەرەوە، ئیدی خوای دادگەر ڕەخنەی لیٚ دەگریٚ و، لە هەموو قورئاندا لە یەك شویٚن و، یەکجاریش بە پیٚغەمبەری خاتەم دەفەرمویٚ: (کلّا) واتە: جاریٚکی دیکە شتی وا نەکەی! لە سووڕەتی (عبس) دا، دەفەرمویٚ:

﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ ﴾ (عبس).

---

[٥] - بڕوانە: المصباح المنیر في تهذیب تفسیر ابن كثیر، ص ١٠٩١ـ ١٠٩٢.

واتە: ڕووی خۆی گرژ کرد و ڕووی خۆی وەرگێڕا، کاتێك پیاوە کوێرەکە هات بۆ لای.... دیارە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) پاساوی خۆی بە دەستەوە بوو، چونکە زلەزلانی قوڕەیش دەیانگوت: ئەگەر ئەو کوێر و کۆیلە و ڕەش و ڕووتانە، بێنە مەجلیسی تۆ، ئێمە دانانیشین، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: جارێ بڕۆ، با قسە لەگەڵ ئەوانەدا بکەم، بەڵکو خوا دڵیان نەرم بکا، خواش ڕەخنەی لێگرت و فەرمووی: با ئەوانەش خوا هیدایەتیان نەدا، چۆن ڕووی خۆت لەو کوێرە گرژ دەکەی؟!، ئنجا ئایا کەس هەیە ڕەخنەی وا لە خۆی بگرێ؟![6]

٣ـ لە سوورەتی (التوبة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾التوبة:٤٣

مونافیقەکان هاتن، کە پاساوو بیانوو بهێننەوە، بۆ ئەوەی نەچن بۆ جەنگی تەبووك، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی دان، ئیدی خوای کارزان بەو بۆنەیەوە، ڕەخنەیەکی میهرەبانانەی لێگرت و فەرمووی: خوا لێت ببوورێ بۆچی ئیزنت دان؟!، تاکو بۆت دەردەکەوێ داخۆ کامانەیان ڕاست دەکەن درۆزنەکانیش بزانی.[7]

پاشان دەڵێین: ئەو کەسەی دەڵێ: (محمد) (علیه الصلاة والسلام) بۆ خۆی قورئانی داناوە، قسەکەی نیشانەی ئەوەیە، کە شارەزای قورئان نیە، ئەگەرنا تەماشا دەکەین، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمایشتی خۆی

---

[6] - سەرچاوەی پێشو، ص ١٤٨٢، و سنن الترمذي، و موطأ مالك.

[7] - هەمان سەرچاوە، ص ٥٧١.

هەیە و، خەڵك توانیویەتی بەناوی پێغەمبەری خواوە، فەرمایشت هەڵبەستێ، (واتە: قسەی هەڵبەستراو)، بەڵام کەس ئایا توانیویەتی ئایاتێك، وشەیەك، بخاتە نێو قورئان؟ نەخێر، چونکە هەر چەندە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە هەموو کەس ڕەوانبێژتر بووە، بەڵام فەرمایشتی ئەویش جیایە لە فەرمایشتی خوا، چونکە دواجار ئەویش هەر مرۆڤە، بۆیە هەڵبەستەران (وَضّاعون) توانیویانە شێوەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) قسە بکەن و، قسەی بەدەمەوە هەڵبەستن، بەڵام کەس نەیتوانیوە ڕستەیەك، وشەیەك، بخاتە نێو قورئان، لەبەر ئەوەی قورئان فەرمایشتی خوایە، بۆیە کەسێك کە شارەزای قورئان بێت، ئەو جۆرە قسانە ناکات.

## ٣ـ دەربارەی شەریعەت:

### گومانی حەوتەم:

قورئان و سوننەت چەسپاون، ئایاتەکان دیارن، فەرمایشتەکانیش دیارن، لێیان کەم و زیاد ناکرێ، بەڵام ژیان بەردەوام لە گۆڕاندایە، ئنجا ئایا دینێکی وەستاو، چۆن بە فریای ژینێکی گۆڕاو دەکەوێت[٨]؟!

---

[٨] ئەو بابەتەم لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان)دا باس کردووە، وەڵامی ئەو پرسیارەم داوەتەوە.

عەلمانییەکان زۆر جار دەڵێن: ئێوە دەتانەوێ بمانگێڕنەوە بۆ سەدەکانی نێوەڕاست؟ دەتانەوێ بمانگێڕنەوە بۆ هەزار و چوار سەد (١٤٠٠) ساڵ لەمەو پێش؟

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە قورئان، خوایەك ناردوویەتی، کە (١٤٠٠) ساڵ لەمەو پێشی لە پێش چاو بووە، پێش ئەوە و ئێستاش و دوای ئێستاشی لەبەر چاوە، ئێمە نامانەوێ کەس بگێڕینەوە بۆ (١٤٠٠) ساڵ لەمەو پێش‌و دەمانەوێ لە ئێستادا بژین، لە واقیعی ئێستاماندا، بەڵێ، بە دڵنیایی دەمانەوێ بە قورئان و سوننەتەوە پابەند بین، کە پێش زیاتر لە هەزار و چوار سەد (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر دابەزێنراون، بەڵام دەمانەوێ بە عەقڵی ئێستا لە دینەکەمان تێبگەین، ئنجا بەداخەوە زۆر کەس، دین‌و تێگەیشتن لە دین دا تێکەڵ دەکا، نەك هەر خەڵکی عەلمانیی، زۆر جار بەشێك لە مەلا و مامۆستایەکانیش، دین و تێگەیشتن لە دین، تێکەڵ دەکەن! کە بێگومان ئەوە هەڵەیەکی زل و کوشندەیە، چونکە هەرچی مرۆڤ بەرهەمی هێناوە: لە بواری فیقهدا، لە بواری عەقیدەو عیلمی کەلامدا، لە بواری تەزکیەی نەفس و ئەخلاقدا، لە بواری حوکمڕانیی و سیاسەتی شەرعییدا، لە بواری مێژوودا، لە بواری ئوصوولی فیقهدا، هەمووی دەگونجێ بەشێکی ڕاست بێ و، دەگونجێ بەشێکیشی ناڕاست بێ، تێگەیشتنی بەشەر بۆ دین، بۆ وەحی، پەیوەستە بە کات‌و شوێنی خۆیەوە، پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) لە ڕۆژگاری خۆیدا، بە شێوەیەك کۆمەڵگای خۆی ئیدارە دەکرد، گونجاو (متناسب) بوو لەگەڵ

ڕۆژگاری خۆیدا، بەڵام ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) هەندێك شتی ئیداریی زیاد کرد و گۆڕی، ئنجا لە سەردەمی عومەردا (خوا لێی ڕازی بێت)، چونکە دەوڵەتی ئیسلامیی فراوان بوو، زۆر شتی ئیداریی داهێنا، کە هیچیان لەسەردەمی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) نەبوون، بۆ وێنە:

١ــ دیوانەکانی دانان، دیوانی سەربازان، دیوانی خەڕاج، دیوانی زەکات....هتد. کە هیچیان لە سەردەمی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) نەبوون.

٢ـ شاری نوێی دروستکردن (تمصیر الأمصار)، بۆ ئەوەی ئەو سوپا و سەربازانە، کە دەیاننێرێ، تێکەڵ نەبن بە خەڵك.

٣ـ پۆستە و بەریدی دانا.

٤ـ زیندان (سجن)ی دانا:

هەروەها زۆر شتی دیکەی داهێنا، دوایی وردە وردە لە سەردەمی حوکمڕانەکانی دیکەشدا، بەهرەیان وەردەگرت لە ئەزموونی حوکمڕانیی (ڕۆم) و (فارس)، هیچ کەسیش دەستی نەگرتبوون، بۆچی؟ چونکە مادام کۆمەڵگا دەگۆڕێ، تۆش دەبێ تێگەیشتنی تازەو تیگەیشتنی گونجاو لەگەڵ ڕۆژگارت، بۆ قورئان و بۆ وەحی هەبێ.

ئەوەی بە کەڵکی هەموو کات و ڕۆژگارێك دێت، بەس قورئانە، هەروەها سوننەتی پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) بەهەمان شێوە، بەڵام ئەو بەشەی، کە وەك دین فەرموویەتیو وەك وەحی خوا، بە ئێمەی ڕاگەیاندوە، نەك ئەو بەشەی، کە وەك ئەزموونی بەشەرییە، بۆ نموونە:

١ـ فەرموویەتی: دارخورما موتوربەش نەکەن، زیانی نیە، دوایی هاوەڵان بۆیان دەرکەوتوە، کە دارخورما ئەگەر موتوربە نەکریێ، بەر ناگریێ، ئنجا کە گوتوویانە: ئەی پێغەمبەری خوا! (علیە الصلاة والسلام) دارخورمایەکان بەریان نەگرت؟، فەرمووی: بۆچی موتوربەتان نەکردن؟ گوتیان: ئاخر تۆ بەلامانەوە ڕەت بووی، فەرمووت: ئەگەر موتوربەشیان نەکەن زیانی نیە! فەرمووی: من نەمگوت: وەك دین لێم وەربگرن، ئەوە تەنیا بۆچوونی خۆم بوو، بەڵام مادام بۆ خۆتان دەتانزانی، ئەگەر دارخورمایەکان موتوربەیان نەکەن، بەرناگرن، قسەکەی منتان بۆچی وەردەگرت! خۆ من وەك دین پێم نەگوتن؟! دوایی فەرمووی: (أنتم أعلم بأمر دنیاکم) واتە: ئێوە لە کاروباری دنیای خۆتاندا شارەزاترن، ئەگەر شتێکم وەك وەحی پێگوتن، لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر شتێکم وەك بۆچوونی خۆم پێگوتن، وەك دین لێم وەرمەگرن، واتە: پێتان وانەبێ، کە لەسەرتان فەرزە، وەك دینداریی بەو جۆرە بیروڕا وبۆچوونانەمەوە، پابەند بن[٩].

[٩] – ئەو بەسەرهاتە لە (صحیح مسلم)دا هاتوە، بە سێ ڕیوایەت، کە ئەمە دەقەکانیانە، بە ماناکردنەوە:

١ـ عن موسى بن طلحة عن أبيه قال: مررت مع الرسول الله بقوم على رؤوس النخل، فقال: ما يصنع هؤلاء؟ فقالوا: يُلَقِّحونه، يجعلون الذَّكر في الأنثى، فتلقح، فقال رسول الله: ما أظن يغني ذلك شيئاً، قال: فَاخْبِروا بذلك، فتركوه، فَأُخْبِرَ رَسولُ الله بذلك، فقال: إنْ كان ينفعهم، فَلْيصنعوه، فإني إنَّما ظَنَنْتُ ظناً، فلا تؤاخذوني بالظن، ولكن اذا حَدَّثتكم عن الله شيئاً، فخذوا به، فإنِّي لن أكذب على الله (عزوجل). رواه مسلم: ٦٠٧٩.

واتە: مووسای کوڕی (طلحة) لە باییەوە گێڕاویەتەوە، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بەلای کۆمەڵێکدا ڕەت بووین، لەسەر گلۆفکی دارخورمایان، فەرمووی: ئەوانە چی دەکەن؟ گوتیان:متوربەی دەکەن، تۆوی نێرەکە دەخەنە سەر مێ یەکە و، متوربە دەبێ.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: پێم وانیە ئەوە هیچ سوودی هەبێت، ئەوانیش ئەو هەواڵەیان پێدرا و، ئیدی وازایان لێ هێنا، دوایی هەواڵی ئەوەش بە پێغەمبەر درا، فەرمووی: ئەگەر سوودیان پێ دەگەیەنێ، با بیکەن، من تەنیا گومانم برد، ئێوە بە گومان مەمگرن، بەڵام ئەگەر بەناوی خواوە شتێکم پێ گوتن، لێم وەربگرن، بە دڵنیاییی درۆ بە ناوی خوا (عز وجل) ناکەم.

٢ـ عن رافع بن خديج قال: قدم النبــيُّ المدينة وهم يُؤبِّرون النخل، يقول: يُلقِّحون النخل، فقال: ما تصنعون؟ قالوا: كنا نصنعه، قال: لعلكم لو لم تفعلوا، كان خيراً، فتركوه، فَنَفَضَتْ أو فَنَقَصَتْ. قال: فذكروا ذلك له، فقال: إنَّما أنا بشر، إذا أمرتكم بشيءٍ من دينكم، فخذوا به، وإذا أمرتكم بشيءٍ من رَأْيي، فإنَّما أنا بشر. رواه مسلم ٦٠٨٠.

واتە: رافیعی کوڕی خەدیج دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، هاتە مەدینە، ئەوانیش دارخورمایان متوربە دەکردن، فەرمووی: چی دەکەن؟ گوتیان: هەروامان کردوە، فەرمووی: ڕەنگە ئەگەر نەیکەن باشتر بێ، ئەوانیش دەستیان لێ هەڵگرت، بەڵام بەرەکەیان هەڵوەری، یان کەمی کرد، دەڵێ: ئەوەیان بۆ باس کرد، فەرمووی: منیش هەر مرۆڤم، ئەگەر لە ئایینتان شتێکم پێ گوتن، وەریبگرن، بەڵام ئەگەر ڕایەکی خۆمم پێ گوتن، من تەنیا مرۆڤم، {یانی دەگونجێ بیپێکم و دەشگونجێ نەیپێکم}.

٣ـ عن أنس أن النبي (صلى الله عليه وسلم)، مَرَّ بقومٍ يُلَقِّحون، النَّخلَ، فقال: لو لم تفعلوا لصلح، قال: فَخَرَجَ شِيْصاً فمر بهم، فقال: ما لِنَخْلكم؟ قالوا: قلت: كذا و كذا، قال: أنتم أعلم بأمر دنياكم. رواه مسلم: ٦٠٨١.

واتە: لە ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەلای کۆمەڵێك دا ڕەت بوو، کە دارخورمایان متوربە دەکردن، فەرمووی: ئەگەر واش

٢ـ دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) گوتوویەتی: (كان رسولُ الله يحب الحلواء و العسل) رواه البخاري: واتە: پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) حەلوا (شیرینی) و هەنگوینی حەز لێبوو.

ئنجا ئایا هەر کەسێك ڕاست بۆوە، دەبێ بچێ هەنگوین و حەلوا بخوات؟ ئەگەر نەخۆشیی شەکرەشی هەبێ؟ بە دڵنیاییەوە، نا..! چونکە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) وەك دینداریی ئەوەی نەکردوە، بەڵکو وەك سروشتی بەشەریی کردوویەتی.

٣ـ پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) لە نیوە دورگەی عەرەبییدا ژیاوە، جزداشەی پۆشیوە و، نەعلی لە پێ کردوە، کە بێگومان ئەو بەرگو پۆشاکەی ئەوێ، لەگەڵ ئاوو هەوای (طقس و مناخ)ی ئەوێدا گونجاوە، ئنجا ئایا سوننەتە ئێمە ئێستا لە کوردستان، جزداشە لەبەر بکەین؟ یان نەعل لە پێ بکەین؟ وەك هەندێك کەس بە نەزانیی، ئاوا لە هەموو شتێکدا دەیانەوێت چاو لە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) بکەن، بەبێ ئەوەی لێکی بدەنەوە ئایا: ئەو شتە پەیوەندیی بە دینەوە هەیە، یان بەس پەیوەندیی بە ژینەوە هەیە، وە پەیوەندیی بە کۆمەڵگا و عورف و نەریتەوە هەیە؟!

---

نەکەن هەر باش دەبێ، دەڵێ: بەرەکەی خراپ بوو، ئنجا کاتێك بە لایاندا تێپەڕی، فەرمووی: دارخورمایەکەتان بۆچی وایە؟ ـــ بەری چاکی نەگرتوە؟ ـــ گوتیان: ئاوا و ئاوات فەرمووی! فەرمووی: خۆتان لە کاروباری دنیاتان شارەزاترن.

٤ـ لـە سـەردەمـی پێغەمبـەردا (علیـه الصـلاة والسـلام) خۆراکیـان زیـاتر خورما بووە، ئنجا ئایا خورما خـواردن سـوننەتەو، وە ئەگـەر شـتێکی لـە خورماشت باشتر چنگ بکەوێ، دەبێ ئیللا هەر خورما بخۆی؟!

**٥ـ** پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) شەڕی بە تیرو کەوان و بە شمشێر و ڕم کـــردوە، ئایـــا ئێمـــەش هەر دەبێ وا بکـەین؟! بێگومـــان نەخێـــر، وە بەمسۆگەریی، ئێمە تەنیا لەو بوارانەدا، کە پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) وەك ئایین و بەرنامەی خوا و، حەڵاڵ و حـەرام و ئـەمر و نـەهی، پێیڕاگەیاندووین، مولزەمین شوێنی بکەوین.

کەواتە: بۆ وەڵامی ئەو پرسـیارە کـە: چـۆن دینێکـی وەسـتاو دەفریـای ژینێکی گۆڕاو دەکەوێ؟ دەڵێین: نە دین هـەمووی وەسـتاوە و، نـە ژینـیش هەمووی گۆڕاوە، دین هەمووی وەستاو نیە، چونکە خوا (سبحانه وتعالی) ئەو شتانەی، کە لە ژیانی بەشەردا چەسپاون و ناگۆڕێن، حوکمی چەسپاو و نەگۆڕی بۆ داناون، وەك بوارەکانی: بوونناسـیی (جیهـانبینیی) و، ئیمـان و عەقیدە و، عیبـادەت و، ئـەخلاق و، بـاری کەسـێتیی، ئەوانـە هـەموویان خوای پەروەردگار یاسای نەگۆڕی بۆ داناون، بۆچی؟ چونکە خـوا ناگۆڕێـت، بۆیە ناسینمان بۆ خوا کاتی خۆی چۆن بـووە، ئێسـتاش هەروایـە و، دوای ئێستاش هەر وادەبێ.

هەروەها ناوەکانی خوا، سیفەتەکانی خوا، بەندایەتیی بۆ خـوا: نوێـژ و، ڕۆژوو و، زەکات و، حەج و، ڕازو نیازو پاڕانـەوە و، قوربـانیی سـەر بـڕین، گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت.

هەروەها ڕەوشتە بنەڕەتییەکان، ڕاست بێژیی هەر چاکە، درۆکردن هەر خراپە، دەست پاکیی هەر باشە، خیانەت هەر خراپە.

دیسان باری کەسێتیی، ئەگەر بویسترێ خێزان دروستبکرێ، هەر دەبێ بەو جۆرە بێ، کە ژنێك و پیاوێك لەسەر بناغەی گرێبەستێك پێکەوەبن و، بۆیەکدی حەڵاڵ دەبن، ئەوە ناگۆڕێ، ڕۆڵەکان مافیان هەیە لەسەر باب و دایکیان، باب و دایکیان مافیان هەیە لەسەر ڕۆڵەکان، ئەوە شتێکی فیترییە و ناگۆڕێ.

بەڵێ، لە ڕۆژئاوا ئێستا خێزانی جۆرا و جۆریان دروستکردوە: دوو ژن پێکەوە و، دوو پیاو پێکەوە!! بەلاّم بە دڵنیایی ئەوە لادانە لە خوارِسك و فیتڕەت، وەك چۆن لادانە لە شەریعەت، ئنجا ئەگەر خەڵك هەمووی وابکات، وەك دایناسۆڕەکان دەبڕێنەوە و قڕ دەبن، وەچەی بەشەر بەوە بەردەوام دەبێ، کە پیاوان و ئافرەتان، لەسەر بناغەی گرێبەستێکی ڕوون و موبارەك، پێکەوە و بۆ یەك حەڵاڵ بن.

بەڵێ، ئەو شتانەی نەگۆڕن لە ژیاندا، شەریعەت یاسای نەگۆڕی بۆ داناون، بەلاّم ئەو شتانەی کە دەگۆڕێن، شەریعەت یان چوارچێوەیەکی فراوانی بۆ داناون، یاخود یاسای وای بۆ داناون، کە بگونجێ دەستکاریی بکرێن، با لەو بارەوە وێنەیەك بێنینەوە:

خوای دادگەر لەو بارەوە، کە کۆمەڵگا دەبێ چۆن ئیدارە بکرێ؟ دەفەرموێ:﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ الشوری: ٣٨، واتە: کاروباری کۆمەڵگا لە نێو خۆیاندا بە ڕاوێژە، ئایا خوا چۆن و لە کوێدا باسی ڕاوێژی

کردوە؟ خستوویەتە نێوان نوێژکردن و ماڵ بەخشین، (واتە: زەکات)ەوە، چونکە هیچ مسوڵمانێك نیە نەزانێ، کە دەبێ نوێژی هەبێ، ئەگەر بیەوێ بە مسوڵمان لە قەڵەم بدرێ، وە دەبێ زەکاتی ماڵی خۆشی بدات، نوێژ حەقی خوایە، زەکاتیش حەقی خەڵکە، خوای کاربەجێش ڕاوێژی خستۆتە بەینی ئەو دووانەوە و، دەفەرموێ:﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ الشوری: ٣٨ واتە: ئەوانە (بەندە پەسندەکانی خوان) کە بەردەوام بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە چوون‌و، نوێژیان بەرپا کردوە، کاروباریان بە ڕاوێژ بەڕێوە دەبەن‌و لەوەش، کە پێمان داون دەبەخشن.

واتە: ئەگەر نوێژ پایەی مەعنەویی مسوڵمانەتییە و، زەکات پایەی ئابوورییەتی، ڕاوێژ (شوری)یش پایەی سیاسیی مسوڵمانەتییە، یانی: کاروباری موسڵمانان، دەبێ لەسەر بناغەی ڕاوێژ ئیدارە بکرێ، وەك زانایەك دەڵێ: ئێستا لە هەندێك لە وڵاتانی ئیسلامییدا لە جیاتی﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، واتە: کاروباریان بە ڕاوێژە، بۆتە: (و أمرهم شُوربَة بینهم) یانی: حوکمڕانیی ئەو وڵات و خەڵك ( بلاد و عباد)ـەیان وەك شۆربایەك، وەك قاپە چێشتێك بۆ خۆیان و بنەماڵەکەیان داناوە و، بەس بە هی خۆیانی دەزانن!!.

بەڵێ، کۆمەڵگا چۆن دەبێ ئیدارە بکرێ؟ خوا دەفەرموێ: بە ڕاوێژ، بەڵام دەبێ ئەو ڕاوێژە چۆن بێ؟ ئایا خەڵك هەمووی کۆبکرێتەوە؟ وەك

کاتی خۆی لە یۆنانی کۆندا وابووە، لە گۆڕەپانێکدا خەڵکیان هەموو کۆکردۆتەوە و پرسیان پێکردوون، بەڵام ئافرەتیان لەگەڵ نەبوون، حیسابیان نەکردوون، هەروەها کۆیلەشیان لەگەڵ نەبوون، ئایا ئاوا بێ؟! یاخود بە پێی سیستمی نوێنەرایەتیی بێت، هەر چەند هەزار کەسێك نوێنەرێکی خۆیان هەڵبژێرن؟ ئەوە شەرع دیاریی نەکردوە، بۆیە هەرکامێکیان بێ، دەبێت، دەگونجێ ئەگەر هەڵسووڕا هەموو خەڵك کۆبکرێتەوە، وەك لە دێیەکدا، لەشوێنێکدا کە خەڵکەکەی کەمە، گرنگ ئەوەیە، خوا دەفەرموێ: دەسەڵات هی خەڵکە، حوکمڕانیی لە ئەسڵدا هی خەڵکە، چونکە وشەی (أمر) بە مانای: حوکم و ئیدارە و دەسەڵات و کار و بار، دێ، ئنجا کە پاڵدراوەتە لای خەڵك﴿ وَأَمْرُهُمْ ﴾، کەواتە: هی خۆیانە، شێوازی گشتی حوکمڕانیی و کار و بار بەڕێوەبردنیش ڕاوێژە ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾. بەڵام ئایا خەڵك و کۆمەڵگا چۆن ئەو ڕاوێژ کردنە ڕێکدەخات؟ ئەوە خوا بەجێی هێشتوە بۆ پەرەسەندن و گەشەسەندنی کۆمەڵگاو، بۆ پێداویستیی ژیانو گوزەرانی ئەو خەڵکە، لە هەر قۆناغێکدا، کە تێی دەکەوێ.

زانایان لەو بارەوە بنچینەیەکی گرنگیان داناوە، دەڵێن: (إجمالٌ في المتغيِّرات، تفصيلٌ في الثَّوابت)، واتە: ئەو شتانەی، کە دەگۆڕێن و گۆڕانیان بەسەردا دێت، وەك: بواری حوکم و سیاسەت، دارایی و ئابووریی، جەنگ و ئاشتیی، پەیوەندییەکان، داهێنان و بەرەو پێشبردنی ژیان و گوزەران، ئاژەڵداریی، کشتوکاڵ، پیشەسازیی، ئەوانە هەموویان دەگۆڕێن، شەریعەت یاسای کورتی بۆ داناون، چوارچێوەیەکی فراوانی بۆ داناون.

بەڵام نەگۆڕەكان ئەو شتانەی، كە ناگۆڕێن، شەریعەت چۆتە نێو وردەكارییەكانیانەوە، بۆ نموونە: دەستنوێژ چۆن دەگیرێ؟ لە ئایەتی ژمارە (٦)ی سووڕەتی (المائدة)دا، خوای پەروەردگار باسی كردوە، دەستنوێژ ئاوا دەگیرێ، چونكە ناگۆڕێ، ئنجا ئەگەر ئاوت دەست نەكەوت، تەیەممومم، وەك خوا (عز وجل)فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦ ﴾ المائدة: ٦.

بەڵام ئایا دەوڵەت چۆن دادەمەزرێ؟ لەسۆنگەی ئەوەوە، كە ئەوە لەمەودای عەقڵی ئینساندایە، خوای كاربەجێ نەچۆتە نێو وردەكارییەكانەوە، بەس فەرموویەتی: دەبێ لە نێو مسوڵمانانندا كەسانێك هەبن كاربەدەست بن و، بە قسەیان بكەن و خاوەن فەرمان (أولي الأمر)بن.

ئەویش بۆ زانیارییتان! لە ئیسلامدا (أولي الأمر) هەیە، نەك (وليّ أمر)، وەك هەندێك بە ناوی ئیسلامەوە ڕەواج بە حوكمی تاكڕەویی و حوكمی ئیستبداد و خۆسەپاندن دەدەن و، ویردی سەر زمانیان بۆتە وەلی ئەمر، وەلی ئەمر!، لە قورئاندا وشەی (ولي الأمر) نەهاتووە، بەڵكو تەنیا وشەی: (أولي الأمر) هاتووە، ئەویش دوو جاران، لە سووڕەتی (النساء)دا:

کـە ئایـەتی ژمـارە (٥٩) و ئایـەتی ژمـارە (٨٣)ن، (أولـي الأمـر)ش، واتـە:کاربەدەسـتان، ئەوانـەی، کـە مسـوڵمانان کاریـان پـێ دەسـپێرن و دەیانکەنە بەرپرسی خۆیان، ئیدارەی وڵات و حوکمیان تەسلیم دەکـەن، کـە حوکمەکـەش خـوا نـاوی لێنـاوە ئەمانـەت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾(النسـاء- ٥٨) واتـە: خـوا فـەرمانتان پێـدەکات سپاردەکان بە خەڵکی شایستەی خۆیان بسپێرن.

ئنجـا ئـەو سـپاردەیە، ئەگـەر نوێنەرایەتییـە لـە پەرلەمانـدا، لـە ئەنجوومەنی نوێنەراندا، ئەگەر حوکمڕانیە لە دەسـەڵاتی جێبـەجێ کردنـدا، ئەگـەر دەسـەڵاتی دادوەرییـە، ئنجـا ئەگـەر بەرپرسـە ئیدارییەکـە: ئەگـەر پارێزگارە، قائیمقامـە، بەڕێوبـەری ناحیەیە...هتـد، دەبـێ خـەڵك خۆیـان بەرپرسانی خۆیان هەڵبـژێرن، لـە هـەموو ئاسـتەکاندا، ئـەوجار ڕەوایـەتیی (شرعیة) پەیدا دەکەن و دەبنە خـاوەن ئـەمر و، کـە بۆیـان هەیـە فـەرمان بکەن، لە چوارچێوەی شـەریعەتدا، گـرنگ ئەوەیـە خـەڵك ئـەو ئەمانـەتی حوکمڕانیـەیان پـێ دەسـپێرێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾(النسـاء- ٥٨) هەڵبەتـە وێـڕای سـیاقی ئایاتـەکان و ڕواڵـەتی وشەکان بەوەش ڕا دەزانین، کە مەبەست لە (الأمانات) لێرەدا سـپاردەکانی بەرپرسـیارێتیی و حـوکمڕانیین، چـونکە: ڕۆژێـك کابرایـەك پرسـیاری لـە پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) کرد، گوتی: (يا رسولَ الله! متى السـاعة؟!!) ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئـاخر زەمـان (سـاعة) کـەنگێ دێـت؟ {(سـاعة)

بەمانای قیامەت نیە، بە مانای ئاخیر زەمان دێت} ، یانی: کەنگێ ئەم گەردوونە تێك دەچێت؟ پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام)یش فەرمووی: (إذا وُسِّد الأمْر إلى غير أهله، فانتظر الساعة) رواه البخاري: واتە: هەر کاتێك حوکمڕانیی و کاروبار درا بە خەڵکی غەیری خۆی، {یانی: بە خەڵکی ناشایستە و بێ کەفائەت سپێردرا} چاوەڕێی ئاخیر زەمان بکە.

ئاشکراشە کەسێك بە سادەیی تەماشای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) بکات، دەڵێ: ئەدی بۆچی ئاخر زەمان هەرنەهات؟ ئەو هەموو کارو بار و حوکمڕانییە بە خەڵکی نائەهل دەسپێردرێ، کەچی ئاخیر زەمان (ساعة)ش هەر نەهات!! بەڵام بە دڵنیایی پێغەمبەری دانا مەبەستی ئەوە بووە کە: ئاخیر زەمانی هەر کارێك، کاتێك دێت، کە بەخەڵکی ناشایستە بسپێردرێ، بۆ وێنە: ئێستا ئەم وڵاتەی خۆمان، من بۆیە زۆر خەفەت دەخۆم لە ئایندەی ئەم وڵاتەی خۆمان، چونکە تەماشا دەکەم بە شێوەیەکی زۆر بێ کەفائەت و ناشایست بەڕێوە دەبرێ، بە دڵنیاییش: هەر کارێك بەبێ کەفائەتیی، بە ناشایستەیی بەڕێوەبردرا، بە خراپیی ئیدارە کراو، بە خەڵکێکی خراپ و ناشایست سپێردرا، ئاخیر زەمانی دێت، درەنگ یان زوو.

کەواتە: بەرپرسیارێتیی لە نێو کۆمەڵگادا، ئەمانەتە، ئنجا مولکی خەڵکیشە، چونکە خوا فەرموویەتی:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ ﴾، واتە: خوا فەرمانتان پێدەکات، بە ڕاناوی کۆ دەیهێنێت، چونکە لە ئەسڵدا کۆمەڵگا

خاوەنی حوکمڕانیی و بەرپرسیارێتییە، وە دەبێ بیسپێرن بە کەسانێك، کە بە کەفائەت و شایستەیان دەزانن.

هەڵبەتە بۆیەش لەو شتانەدا کە گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، شەریعەت نەچۆتە نێو وردەکاریەکانیەوە، تاکو دەست و پێی خەڵك نەبەستێ و بەکارهێنانی عەقڵ و ئیجتیهادیان ببێ، بەڵام لەو شتانەدا، کە لە توانای عەقڵ بەدەرن، خوای پەروەردگار نوختەی خستۆتە سەر پیت.

پوختەی قسان: نە دین هەمووی وەستاوە و، نە ژینیش هەمووی گۆڕاوە، ئنجا ئەو شتانەی، کە لە ژیاندا دەگۆڕێن، شەریعەت، یاسای فراوان و گشتی و گۆڕاوی بۆ داناون، ئەو شتانەش، کە چەسپاون، یاسای چەسپاوی بۆ داناون.

ئەوە وەڵامی هەندێك لەو گومانانە بوو، کە باس دەکرێن و دەورووژێنرێن، دیارە ئەگەر بویسترێ هەر کامێك لە وانە حەقی خۆی بدەینێ، دەبێ چەندان کۆڕیان بۆ تەرخان بکەین، لێرەدا دێمە کۆتایی بابەتەکەم.

## پرسیار و ئیشکالی یەکەم:

ئایا هەبوونی بەڵاو گرفتاریی و نەخۆشیی و..هتد، لەگەڵ بەزەیی و میهرەبانیی بێ سنووری خوادا، دەگونجێ؟!

وەڵام:

١ـ سروشتی ژیانی دنیا، کە ژیانی دنیا بۆ تێدا تاقیکردنەوەی مرۆڤ و جین دانراوە، خوازیاری ئەوەیە، کە ژیانی دنیا لە بەڵاو کارەسات و ناخۆشیی خاڵیی نەبێ، وەك خوای کاربەزان فەرموویەتی:﴿وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ٣٥﴾ الأنبياء.

واتە: بە خراپە و ناخۆشیی و، چاکە و خۆشیی تاقییتان دەکەینەوە و، هەر بۆ لای ئێمەش دەگێڕدرێنەوە.

٢ـ زۆرجاران بەڵا (مِحْنَة) خەڵات (مِنْحة)ی لە خۆگرتوە، بۆ نموونە: سەرنجی خرانە نێو بیر و، بوختان پێکران و، بە ناهەق زینددانیی کرانی (یوسوف) بدەن! کە هەموو ئەو گرفتاریی و بەڵایانەی، وەك پەیژەی سەرکەوتن و بەرزبوونەوەی لە دنیا و دوارۆژدا، وابوون.

٣ـ بەڵێ، بەزەیی و میهرەبانیی خوا بێ سنوور و ڕەهایە، بەڵام حیکمەت و ویست و دەسەڵات و بێ نیازیی خواش، هەر ڕەها و بێ سنوورن و، سیفەتە بەرز و بێ وێنەکانی خوای بەرز و مەزن، هەموویان

پێکەوە و وێکڕا کاردەکەن، نەك جیاجیا، ئنجا خوای زانا و کاربەجێش ژیانی دنیای کردوە بە پێشەکیی ژیانی ڕۆژی دوایی، کە هەر ئەوێ مەنزڵگای ژیانی ڕاستەقینە و بەختەوەریی و بە مراد گەیشتنە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْآخِرَةَ لَهِيَ ٱلْحَيَوَانُۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: بێگومان تەنیا مەنزڵگای دوارِۆژ ژیانی ڕاستەقینەیە، ئەگەر بزانن.

## پرسیار و ئیشکالی دووەم:

ئایا هەمیشەیی بوونی کافران لە دۆزەخدا، لە بەرانبەر ژیانێکی زوو تێپەڕی شەست حەفتا (٦٠ـ٧٠) ساڵییدا، ستەم نیە؟!.

وەڵام:

١ـ بێگومان بابای کافر عەزمی جەزم کردوە، کە ئەگەر ملیۆنان ساڵ بژی، هەر لەسەر ڕێچکە و بەرنامەی خۆی بمێنێتەوە، بگرە خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُۖ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: وەئەگەر کافرەکان ببینی، کە لەسەر ئاگر وەستێنراون، دەڵێن: ئەی خۆزگە گێڕرابااینەوە ـ بۆ دنیا ـ و ئایەتەکانی پەروەردگاریشمان بەدرۆ

دانەنابات‌و لەبڕواداران بووبایەن، بەڵكو ئەوەی پێشتر پەنهانیان دەكرد بۆیان دەركەوتوەو، ئەگەر گێڕرابانەوەش، دووبارە دەگەڕانەوە سەر ئەوەی لێیان قەدەغە كرابوو و، بە دڵنیایی ئەوان درۆزنن.

كەواتە: كافرەكان ئەگەر گریمان لە قیامەتیشەوە بهێنرێنەوە بۆ ژیانی دنیا، دووبارە لەسەر هەمان ڕێچكە و بەرنامە تێهەڵدەچنەوە.

٢ــ ژیانی دنیاش هەرچەندە كەم و كورتە، بەڵام بۆ كەسانێك مەبەستیان بێ و بیانەوێ، بایی خواناسین و خۆناسین و خواپەرستییان دەكات، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾﴾ فاطر، واتە: ئایا هێندەمان تەمەن پێنەدان، كە ئەگەر كەسێك ویستبای بیری بكەوێتەوە و پەند وەربگرێ، پەندی وەردەگرت، وە ئاگادار كەرەوەشتان بۆ هات، دەبچێژن! ستەمكاران هیچ سەرخەر و یاریدەدەریان نیە.

٣ـ بە پێی سیستم (نظم)ێك، كە خوا دایناوە، ئەو حاڵەتەی مرۆڤ لەژیانی دنیایدا وەدەستی دێنێ ـ لە خێر و شەڕ ـ لە قیامەتیشدا لەسەری بەردەوام دەبێ و توانای دەستبەرداربوونی نابێ.

٤ـ مەرجیش نیە هەر كەس نا مسوڵمان (غیر المسلم)بوو، پێناسەی كافر بیگرێتەوە، چونكە وشەی (كافر) لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە (اسم الفاعل)ەو كەسێكە كە ئیسلامی ناسیبێت و ڕەفزی كردبێ و شاردبێتیەوە، چونكە وشەی (كافر) لە (كَفْر)ەوە هاتوە، كە بە مانای

شاردنەوە و پەنهان کردن دێت[١٠]، هەر بۆیەش خوا ناوی لە جوتیاران (زرّاع) ناوە (كُفّار)، وەك فەرموویەتی: ﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ﴿٢٠﴾﴾ الحديد، واتە: ژیانی دنیا وەك بارانێکە جوتیاران بە ڕووەکەکەی سەرسام بوون.

ئنجا لە حالێکدا کە خوای کارزان فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾ الإسراء: واتە: ئێمە سزادەری بەندەکان نین، تاکو پێغەمبەر نەنێرین، لە هەمانکاتیشدا بە مەرجیشی گرتوە، کە دەبێ خەڵك پەیامی ڕۆشنی پێغەمبەرانیان پێ بگات، ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾﴾ العنكبوت.

کەواتە: کەسانێك کە پەیامی ڕۆشنی خوایان پێ نەگەییبێت و ڕەفزیان نەکردبێ و، کەمتەرخەمیش نەبووبن لە ناسین و زانینی پەیام و بەرنامەی خوادا، بەکافر دانانرێن و، ئەو هەڕەشانەی لە کافرانیش کراون، نایانگرنەوە.



---

[١٠] - مختار الصحاح، ص ٥٧٣.

## پرسیار و ئیشكالی سێیەم:

مادام كردەوەكانی مرۆڤ لەلایەن خواوە ئەندازەگیریی (تقدیر)كرابن و نووسرابن، ئایا چی بۆ ئازادیی و ئیرادەی مرۆڤ دەمێنێتەوە؟!

وەڵام:

١- خوا لە ئەزەلەوە نەخشەی دروستكراوەكانی كێشاوە و، هەموو شتێكی لە بارەیانەوە زانیوە، بەڵام زانیویەتی، كە مرۆڤەكان بەویستی ئازادانەی خۆیان، كردەوەكانیان هەڵدەبژێرن و ئەنجام دەدەن، هەر بۆیەش سزا و پاداشت ڕوو لە كردەوەكانیان دەكەن.

٢- نووسینی خوا (كتابة الله) كە زۆر پێدەچێ تەعبیرێكی ڕەمزیی بێت بۆ زانین و زانیاریی ئەزەلیی بێ سنووری خوا، وەك ئەوەیە مامۆستایەك هەر لە سەرەتای ساڵی خوێندنەوە: لە دەفتەری تێبینییەكان (دفتر الملاحظات)ی دا بۆچوونەكانی خۆی لە بارەی قوتابییەكانیەوە تۆمار بكات: فلان كەس: یەكەم، فلان كەس: دووەم، فلان كەس: دەرچوو، فلان كەس: كەوتوو.... هەڵبەتە ئەویش لەبەر ڕۆشنایی شارەزایی بە حاڵ و باڵیاندا، لە ڕووی تێكۆشان و تەنبەڵیی و ...هتدەوە، ئنجا وەك چۆن نووسینی مامۆستایەكە، هۆكاری دەرەنجامەكانی قوتابییەكان نیە، بەهەمان شێوەش زانین و نووسین و ئەندازەگیریی خوای زانا و تواناش، هۆكاری دەرەنجامەكانی ژیانی مرۆڤەكان نیە.

## پرسیار و ئیشکالی چوارەم:

ئایا سزادانی نێو گۆڕ، بەر لە دادگایی کردن (محاكمة) ستەم نیە؟!

وەڵام:

١ـ سزادانی نێو گۆڕ، کە بە (عذاب القبر) تەعبیری لێ کراوە، بەڵام من پێم وایە ڕاست وایە بگوترێ: (سزای پاش مەرگ و مردن)، چونکە زۆر کەس لە گۆڕدا نانێژرێ، یان گۆڕی بە قسمەت نابێ و، ئەو سزادانەش شتێکی گشتییە بۆ مرۆڤە گوناحکار و تاوانبارەکان، چ مسوڵمان بن، چ کافر و نامسوڵمان، ئنجا ئەگەر بابای گوناحکار مسوڵمان بێ، ئەوە سزای دوای مەرگ، بۆی دەبێتە مایەی سڕانەوە (كفارة) و سووك بوون، یان یەکجاریی لاچوونی سزای قیامەتی.

ئەگەر کافر و نامسوڵمانیش بێت، ئەوە سزایەکەی لە کاتی گیان کێشرانیەوە دەست پێدەکات و، دوایش بەردەوام دەبێ لە دۆزەخ دا.

٢ـ دیارە سزای قۆناغی بەرزەخیش، جیایە لە هی قیامەت و دوارِۆژ، لە قەدەر ئەو قۆناغە ڕاگوزەرە (مرحلة انتقالية)، بێگومان خوای دادگەر، لێپرسینەوەیەکی کورت لەگەڵ مرۆڤەکان دا دەکات، بەڵام لێپرسینەوە و سزای تێر و تەواوو یەکجاریی، هەڵدەگیرێ بۆ قیامەت. ئەم دوو ئایاتەش بە ڕوونیی ئەو ڕاستییە دەگەیەنن، کە باسمان کردن: ﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾ غافر.

واتــە: وە ســزای ســەخت و خــراپ ئابڵووقــەی دەســتەو دایــەرەی فیرعــەونی دا، کــە بریتیــە لــە ئــاگر، بــەیانیان و ئێــواران لەســەری ڕادەنــوێنرێن، ئــەو ڕۆژەش، کــە ئاخیرزەمــان دێ ـ پاشــان قیامــەت ـ (دەگــوترێ:) دار و دەســتە و شــوێنکەوتوانی فیرعــەون بخەنــە نێــو توندترین سزاوە.

کەواتە: سزادانەکەی بەیانیان و ئێواران بە ئاگر، هی قۆناغی بەرزەخـە، کە لە پاش مردنەوە دەست پێدەکات، ئەوی دیکەش، هی ڕۆژی دواییە.

## پرسیار و ئیشکالی پێنجەم:

خــوا، کــە دروســتکراوەکانی هێناونــە دی، یــان لێیــان بــێ نیــازە، یــان پێویستیی پێیانە، ئەگەر لێیان بێ نیازە، کەواتە: خوا کارێکی بێ هوودەی کردوەو، وە ئەگەر پێویستیی پێیانە، کەواتە: ئاتاجی جگە لە خۆیەتی!

وەڵام:

١ـ بێگومان خوا خاوەنی هەموو نــاوە هەرەباشــەکان و، ســیفەتە هــەرە بەرزەکانە، وەك دەفــەرموێ:﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا ..... ﴿١٨٠﴾ ﴾ الأعــراف. واتــە: وە خــوا نــاوە هــەرە چاکەکانی هــەن، هــەر بــەوان لێــی بپاڕێنەوە، هــەروەها فەرموویــەتی:﴿ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾ الــروم، واتــە: وە ســیفەتی هــەرە بــەرز لەئاسمانەکان و زەویدا، تەنیا هی خوایە، وە ئەو زاڵی کارزانە.

٢ـ یەکێك لە سیفەتە بەرز و بێ وێنەکانی خواش، بریتیە لە بێ نیازیی لە جگە لە خۆی، وەك فەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ ﴾ الإخلاص، واتە: خوا یەکە، کە جێی نیازی سەرجەم دروستکراوەکانیەتی[11]، هەروەها فەرمووویـــــــــــــەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ۝١٥ ﴾ فاطر، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئاتاج و نیازمەندی لای خوان، وە خوا هەر خۆی دەوڵەمەندی ستایش کراوە.

٣ـ بەڵام وەدیهێنانی خوای زانا و کاربەجێ بۆ دروستکراوەکان، لەو ڕووەوەیە، کە خوا خاوەنی ئەو پەڕی بەزەیی و میهرەبانیی و بەخشش و چاکەکاریی یە و، ویستوویەتی بەزەیی و میهرەبانیی بنوێنێ و چاکەکاریی بکات، وەك شایستەی خۆیەتی، بۆیە بوونی بە دروسکراوەکانی بەخشیوەو، لە باشترین شێوەدا هێناونیە دی، وەك فەرموویەتی: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣ ﴾ الأعلـــــى، واتە: ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، ئەو کەسەی هەموو شتێکی دروستکردوە و ڕێکیخستوە. ئەو کەسەی هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردوەو ڕێنمایی کردوە.

---

[11] ـ المصباح المنير، ص ١٥٤١، (الصمد: الذي يصمد اليه الخلائق في حوائجهم ومسائلهم).

نموونەیەك:

باباـیەکی خێرومەنـد و چـاکەکار کـە هاوکـاریی هـەژارێك دەکـات: نەپێویستیی پێیـەتی‌و، وە نـەکارێکی بێهوودەشـی کـردوە، بـەڵکو بـەپێی سروشت و سیفەتی چاکەکارانەی خۆی، ڕەفتاری کردوە!

**پرسیار و ئیشکالی شەشەم:**

بۆچی زۆر کـەس، گـەلێك لـە خـوا دەپاڕێتـەوە، کەچـی هـیچ وەڵامـی ناداتەوە؟!

وەڵام:

١ـ مادام خوا فەرموویەتی و گفتی داوە: وەڵامی هەر کەسێك بداتەوە، کـە لێـی دەپاڕێتـەوە: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ.......﴿٦٠﴾ ﴾ غـافر، واتـە: وە پـەروەردگارت فـەرمووی: لـێم بپاڕێنـەوە، وەڵامتـان دەدەمەوە... یـان فەرموویـەتی: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ........﴿١٨٦﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: وە هـەرکاتێ بەندەکانم لـە بارەمـەوە لێیـان پرسـی، مـن نـزیکم، وەڵامـی داوای پاڕاوە دەدەمەوە، هەر کات لێم وەپاڕێ.

کەواتە: خوای بەخشـەر وەڵامـی هـەموو پاڕانەوەیـەکی ڕاسـت و سـاغ دەداتەوە.

٢ـ بەڵام بێگومان وەڵامدانەوەی خوا، بۆ داوا و پاڕانـەوەی بەنـدەکانی، تەنیا جۆر و شێوەیەکی نیەو، مەرج نیە ئەوەی داواکەر داوای بکات، ڕێـك ئەوە بکات، وەك لەم فەرموودەیەدا دیارە: (ما مـن مسـلم یـدعو بـدعوة لیس فیها إثم و لا قطیعة رَحِمٍ، إلا أعطـاه الله بهـا إحدى ثـلاثٍ: إمـا أن تُعَجَّل له دعوتُهُ، و إما أن یَدَّخِرَها له في الآخرة، و إما أن یَصْرِفَ عنه من السوء مثلـها)، رواه البخـاري في الأدب المفـرد: ٧١٠، و الحـاکم ١٨١٦، ووافقه الذهبـي عـن أبـی سـعید الخدري، و صـحَّحه الألبـاني في المشـکاة: ٢٢٥٩.

واتە: هیچ مسـوڵمانێك نیـە دوعایـەك بکـات، کـە گونـاهو پچـڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی تێدا نەبێ، مەگـەر یـەکێك لـەو سـێ شـتانەی پـێ دەدات:

١ـ یان داوایەکەی بە زوویی بۆ جێ بە جێ دەکرێ.

٢ـ یان خوا پاداشتەکەی بۆ هەڵدەگرێ بۆ ڕۆژی دوایی.

٣ـ یان بە ئەندازەی ئەوەی، کە داوای کردوە، خوا خراپـە و زیـانی لێ لادەدات.

٣ـ هەڵبەتە مەرجیش نیە، هەمیشە بەرژەوەندیی و خێری بەندە، لـەوە دابێ، کە ئەوەی لـە خـوای داوا دەکـات، بـۆی جـێ بـە جـێ بکـات، یـان بەپێچـەوانەوە: کـە زیـانی لـەوە دابـێ، کـە حـەزی لێ ناکـات، وەك خـوا فەرموویـــەتی: ﴿ .....وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢١٦ ﴾ البقـــرة.

واتە: وە نیزیکە حەز لە شتێك نەکەن و، ئەوەش بۆتان باشتربێ، وە نیزیکە شتێکتان خۆشبوێ و، ئەوە بۆتان خراپتر بێ، وە خوا دەزانێ و ئێوە نازانن.

٤ـ بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە لە پاڕانەوەدا، ئەوەیە کە مرۆڤ بە دڵنیاییەوە لە وەڵامدانەوەی خوا ـ بۆ پاڕانەوەکەی ـ لەوکاتەدا و بەو شێوەیەی حیکمەتی دەیخوازێ بپاڕێتەوە، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (أدْعوا الله و أَنتم موقنون بالإِجابة)، أخرجه أحمد: ٦٦٥٥، والترمذي: ٣٨٢٨، و اللفظ له، وحسَّنه الألباني.

واتە: لە خوا بپاڕێنەوە و، دڵنیا بن لە وەڵام درانەوە.

## پرسیار و ئیشکالی حەوتەم:

ئایا بت و صەنەم شکاندنی ئیبڕاهیم، سووکایەتیی کردن نەبووە بەپیرۆزییەکانی گەلەکەی؟!

<u>وەڵام</u>

بەڵێ، بێگومان ئەوە جۆرێك بووە لە سووکایەتیی کردن، بەڵام ئیبڕاهیم وەك بەڵگە هێنانەوە (إستدلال) لەسەر پووچیی بیرۆکەی بت پەرستیی، پەنای بۆ ئەو کارە بردوە، دوای ئەوەی بە دیالۆگ و وتووێژ بۆی حاڵی نەکراون و، لەو پێناوەدا، -کە تێگەیاندنی گەلەکەیەتی و هۆشیارکردنەوەیان و دەربازکردنیانە لە زەلکاوی بت پەرستیی- ئیبڕاهیم چاوپۆشیی کردوە لەو سووکایەتییە و بە پێی بنچینەی: (إختیار أهون

الشـرّين) (هەڵبـژاردنی کـەمترینی دوو زیانـەکان) یـان بنچـینەی: (غـضُّ الطَّرْف عن المفسدة الصَّغيرة، من أجل تحصيل المصلحة العظيمـة)، واتـە: چاوپۆشیی کردن لە زیانێکی بچووك، لە پێناو هێنانـەدی بەرژەوەندییـەکی مەزندا) ڕەفتاری کردوە.

واتـە: ئیـبراهیم مەبەسـتی بـێ ڕێزیـی و سـووکایەتیی پێکردنـی پیرۆزییـەکان (مُقَدَّسـات)ـی گەلەکـەی نـەبووە، کـە بـت و صـەنەمەکانی شکاندوون، بەڵکو مەبەستی حاڵی کردن و تێگەیاندنی گەلەکەی و، پاشان دەربازکردنیان بووە، لە ڕێچکەی بت پەرستیی و، هێنانیـان بـەرەو ڕێبـازی ڕوونی خوا پەرستیی.

بەسـەرنجدانی ئایـاتـەکـانیش: ئەوەی گوتمان، وەك ڕۆژی ڕوون دیارە:
﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟

يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾﴾ الأنبياء.

واتە: بە دڵنیایی پێشتر سەر ڕاستییمان بە ئیبراهیم بە خشیبوو و، ئێمە پێی زانا بووین. (٥١)کاتێك ئیبراهیم بە بابی و گەلەکەی فەرمووی: ئەم پەیکەرانە چین، کە ئێوە لەسەر پەرستنیان بەردەوامن؟ (٥٢) گوتیان: باب و باپیرانمان لەسەر پەرستنیان دیوە. (٥٣) فەرمووی: بە دڵنیایی خۆتان و باب و باپیرانتان لە گومڕاییەکی ڕووندا بوون. (٥٤) گوتیان: ئایا ڕاستییت بۆ هێناوین، یان لە گاڵتەکەرانی؟ (٥٥) فەرمووی: بەڵکو خاوەنتان خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە. ئەو کەسەی وە دیهێناون، من لەسەر ئەوە لە شایەدانم. (٥٦) سوێند بە خوا پلان لە دژی بتەکانتان دادەنێم، دوای ئەوەی دەڕۆن. (٥٧) ئنجا جگە لە گەورەکەیان هەموویانی وردو خاش کرد، بەڵکو بۆ لای بگەڕێنەوە! (٥٨) گوتیان: کێ ئەوەی بەسەر پەرستراوەکانمان هێناوە؟ بێگومان لە ستەمکارانە. (٥٩) گوتیان: گوێبیستیی گەنجێك بووین باسی دەکردن: ئیبراهیمی پێ دەڵێن. (٦٠) گوتیان: بیهێنن بە بەرچاوی خەڵکەوە بەڵکو بیبینن. (٦١) گوتیان: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ ئەوەت بە پەرستراوەکانمان کردوە؟ (٦٢) گوتی: بەڵکو گەورەکەیان کردوویەتی، لێیان بپرسن، ئەگەر قسە دەکەن! (٦٣) ئەوانیش بەخۆیان دا چوونەوە، گوتیان: بێگومان ئێوە ستەمکارن. (٦٤) پاشان

هەڵگەڕانەوە سەر سەریان، گوتیان: بێگومان دەزانی كە ئەوانە قسە ناكەن! (٦٥) گوتی: ئایا جگە لە خوا شتێك دەپەرستن، كە نەسوودتان پێدەگەیەنێ نەزیان؟ (٦٦) ئۆف بۆ ئێوە و بۆ ئەوەی، كە دەیپەرستن لەجیاتی خوا، ئایا نافامن؟! (٦٧).

## پرسیار و ئیشكالی هەشتەم:

ئایا ئەو سزایانەی لە شەریعەتدا دیارییكراون، زۆر سەخت و توند و تیژ نین: كوشتن، دەست و پێ ڕاست و چەپ بڕین، هەڵواسین؟!

وەڵام:

١ـ سزا (عقوبة) ئەگەر توند و سەخت نەبێ، بە سزا دانانرێ، حیكمەتی سزاش، سڵەماندنەوەی تاوانبارانە لە تاوان، ئنجا ئەگەر سەخت و توند نەبێ، ئامانجەكەی ناهێنێتە دی.

٢ـ سزایەكان لە ئیسلامدا بۆ پاراستنی: ژیان و، هێمنیی و ئاساییش و، وەچە و ڕەچەڵەك و، ئابڕوو كەرامەت و، ماڵ و سامان و، عەقڵ و هۆشن.

ئاشكرایە هیچ كۆمەڵگایەكیش بەختەوەر و تەندروست نابێ، كە هەر كام لەو شەش شتەی تێدا سەلامەت و پارێزراو نەبن، بۆیە ئەو سزایانەی دەبنە مایەی پاراستنی ژیان و، ئاساییش و، ڕەچەڵەك و، ئابڕوو و، سامان و، عەقڵ، پێویستن. هەر كەسێكیش بڵێ: پێویست نین، وادیارە بە تەنگ پارێزرانی ئەو شەش شتەوە نیە!!

٣ـ هیچ سزایەك بەبێ ڕەخساندنی زەمینە و سازبوونی هەل و مەرجی پێویست، دروست نیە بچەسپێنرێ، هەر بۆیەش خەلیفەی دووەم (عمر بن خطاب) (خوا لێی ڕازی بێت)، سزای دەستبڕینی (قطع الید)ی دزانی ڕاگرت، لە ساڵی گرانیی و برسیەتییدا.

٤ـ جێ بە جێ کردنی سزا شەرعییەکان، ئەرکی دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسییە و، دەوڵەتیش پێش چەسپاندنی سزا شەرعییەکان، مولزەمە بەدابینکردنی پێداویستییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا و، پێش ئەوەش فێر کردن و پەروەردەکردنیانو، چەسپاندنی دادگەریی و، ڕێگرتن لە ستەم و چینایەتیی و گەندەڵیی، وە دەبێ بەر لە بیرکردنەوە لە سزادانی بابای دز (سارق)، بیر لە سزادانی گەندەڵکاران و قۆرخکارانی سامان و موڵکی خەڵك و وڵات، بکرێتەوە.

## پرسیار و ئیشکالی نۆیەم:

بۆچی پەڕگیریی و توند و تیژیی (التطرُّف و العُنْف) وەك دیاردەیەکی ئیسلامیی دەکەوێتە بەرچاو، ئەگەر خەتای خودی ئیسلام نەبێ؟!

وەڵام:

١ــ هەر کەس لە حاڵ و باڵی دنیا بێ خەبەر نەبێ، دەزانێ، کەپەڕگیریی و، توندو تیژیی، دیاردەیەکی مرۆیی و جیهانییەو، تایبەت نیە بە هیچ ئایین و کۆمەڵگایەکی دیارییکراوەوە.

٢ـ نکوولّیی لەوە ناکرێ، کە گەلێك دەستە و گرووپی پەڕگیر و توندڕەو، لە نێو مسوڵمانان دا هەن، بە تایبەت لەم ڕۆژگارەدا، بەڵام هۆکارەکەی وێڕای سەرکێڵیی و ڕووکەش لە ئیسلام، حاڵی بوونی ئەو کۆمەڵ و گرووپانە، بریتیە لە حاڵەتی کاردانەوە (رد الفعل)ی بەشێك لە مسوڵمانان بۆ ئەو ستەم و دەستدرێژییەی لێیان دەکرێ، چ لە لایەن زلهێزانی کافرەوە، چ لە لایەن ئەو ڕژێم و حوکمڕانانەوە، کە بە نارەوایەتیی خۆیان بەسەر کۆمەڵگایەکانی مسوڵماناندا سەپاندوە و، لەلایەن زلهێزانی هەلپەرستەوە، دەستیان لە پشت دەدرێ و هاوکاریی دەکرێن!

٣ـ بێگومان ئیسلام بە شایستەی مسوڵمانانی نازانێ، کە تووك نەرم و دەستەمۆ و دەستەپاچە بن، لە بەرانبەر دوژمنانیاندا، بۆیە فەرمانیان پێدەکات بە ئامادەکردنی هێز، بۆ ترساندنی دوژمنان و سڵەماندنەوەیان، لەوەی تەماعیان تێبکەن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ ..... (٦٠) ﴾ الأنفال. واتە: وە هەرچی پێتان دەکرێ لە هێز بۆیان (بۆ کافرانی شەڕ فرۆش) ئامادە بکەن، هەروەها لە ئەسپانی بەستراوە و ڕاگیراو، دوژمنی خوا و دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن، هەروەها کەسانێکی دیکەش، جگە لەوان، ئێوە نایانزانن، خوا دەیانزانێ.....

٤ـ بەڵام سەیر ئەوەیە، کە بەرهەڵستیی کردن و بەرخۆدانی مسوڵمانانی ستەملێکراو، لە لایەن ڕاگەیاندنی چەواشەکارانەی زلهێزانەوە، وا وێنا

بکرێ، کە توندڕەویی و پەڕگیرییەو، ستەم دەستدرێژیی زلهێزانی داگیرکاریش، وەك بەرگریی کردن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادیی و ئاساییش، پیشان بدرێ، وەك شاعیر گوتوویەتی:

إبادة شعب أعزلٍ قضيَّةٌ فيها نظر

قتل شخصٍ في غابةٍ جريمة لا تُغْتَفَر

واتە: قەلاچۆ کردنی گەلێکی بێ چەك، کێشەیەکە، مشتومڕی لەسەرە! کوشتنی کەسێك لە دارستانێکدا، تاوانێکی نەبەخشراوە !

## پرسیار و ئیشکالی دەیەم:

ئەگەر ئیسلام تاکە ئایین و بەرنامەی ڕاست و پارێزراوی خوایە، بۆچی مسوڵمانان ئاوا بەجێماوو بێ سەروبەرن؟!

وەڵام:

١ـ نکوولّیی لەوە ناکرێ، کە وڵاتانی مسوڵمانان بە گشتی، لە چاو وڵاتانی نا مسوڵمانان، دواکەوتوو و بێ سەرو بەرن، ئەمە واقیعێکە دەچێتە چاوی هەر کەسێکەوە.

٢ـ بەڵام بێگومان دنیاو ژیانی مرۆڤ، تەنیا ئەم قۆناغەی ئێستای بەشەر نیە و، قۆناغ و سەدەی دیکەی زۆریش لە ژیانی بەشەر گوزەراون، کە مسوڵمانان تێیاندا پێشکەوتوو، بگرە سەرقافڵەی پێشکەوتن بوون،

لە هەموو ڕوویێکەوە، نەك تەنیا لە ڕووی مادديی و تەکنۆلۆژیاوە، وەك ئێستا هەیە.

٣ـ پێشکەوتن و دواکەوتنی کۆمەڵگایەکانیش ـ لە ڕووی مادديیەوە ـ پەیوەست نیە بە ئیمان و عەقیدەی ڕاست و دروست، یان هەڵە و پووچیانەوە، بەڵکو پێشکەوتن و گەشەکردنی مرۆڤ، لە بواری مادديی دا، زادە و بەرهەمی: پەیبردنی مرۆڤە بە یاساکانی خوا (سنن الله) لە ژیانی بەشەردا و، پێوە پابەندبوونیانە.

باشترین بەڵگە و نموونەش لەو بارەوە، وڵاتی یابانە، کە هەرچەندە زۆربەیان بت پەرست (وثني)ـن، بەڵام لە بواری ژیانی مادديی و تەکنۆلۆژیادا، زۆر پێشکەوتوون و، لە هەندێك ڕووەوە لە وڵاتانی ڕۆژئاواش ـ بە ئەمریکاشەوە ـ پێشکەوتووترن.

هەر بۆیەش خوای کارزان و زانا، لە زۆر شوێنی قورئاندا سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ ناسینی یاساکانی و، پێوە پابەند بوونیان، بۆ وێنە: ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ١٣٧ ﴾ آل عمران. واتە: لە پێش ئێوەدا یاساکانی (خوا) ڕابردوون، دەجا بە زەویدا بڕۆن، سەرنج بدەن! سەرەنجامی بە درۆ دانەران چۆن بووە؟!

## پرسیاری ئیشکالی یازدەیەم

بۆچی لەقورئانێ دا باسی ئەوە نەکراوە، کە خوای کاربەجێ هیچ پێغەمبەری بۆ کۆمەڵگایەکانی : چینو هیندستانو ئەورووپاو ئەمەریکا.. ناردبن؟!

وەڵام:

١- خوای زاناو شەرەزا ڕایگەیاندوە کە: هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، پێغەمبەرێکی وریاکەرەوەی بۆنەنێرێ، وەك فەرموویەتی:( إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيراً وَنَذِيراً وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ) فاطر -٢٤-. واتە: بەدڵنیایی ئێمە تۆمان بەهەق ناردوە، کە موژدەدەرو ترسێنەربیو ، هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە کە: وریاکەرەوەیەکی تێدا نەنێررابێ.

٢- خوای پەنهانزان ڕایگەیاندوە، کە ناوو بەسەرهاتی ژمارەیەك لەپێغەمبەرانی خۆی (عليهم السلام) بۆ ئێمە -لە قورئان دا- باسکردوەو، ناوو بەسەرهاتی ژمارەیەکیشیانی باس نەکردوە:

أ- وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ...) (النساء -١٦٤-).

واتە: پێغەمبەرانێك باسو خواسیانمان پێشتر بۆت باسکردوەو پێغەمبەرانێکیش بەسەرهاتیانمان بۆت نەگێڕاوەتەوە.

ب- وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِنْ قَبْلِكَ مِنْهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ...) (غافر -٧٨-).

واتـــە: وە لـــەپێش تـــۆدا پێغەمبـــەرانێکمان نـــاردوون، هەیانـــە بەسەرهاتیانمان بۆت گێڕاوەتەوەو، هەشیانە باس‌و خواسـیانمان بـۆت نەگێڕاوەتەوە...

کەواتە، مەرج نیە سەرجەم پێغەمبەرانی خـوا (علیهم السلام) نـاوو بەسەرهاتەکانیان لەقورئانیێ دا هاتبن.

٣- وا پێدەچێ بەشەر سەرەتای نیشتەجێ بوونیان لـەدەوری ڕووبارەکـانی (نیل)و (دیجلە)و (فوراٍت) بووبێ‌و، دواتر بـەرەو ناوچـەکانی دیکـەی زەمـین چـووبن، بۆیـەش پێغەمبـەرە مـەزنترەکان: نـووح، ئیـبراهیم، مووسا، عیسا، موحەممـەد، "علیهم الصلاة والسلام"هـەر لـەو ناوچـە جوگرافییەیەدا نیشتەجێ بوون.

٤- هەڵکەوتەی جوگرافیی زەمـین گـۆڕانی زۆری بەسـەرداهاتووەو، مـەرج نیـە کـاتی خۆشـی هـەر ئـاوا بووبـێ، کەئێسـتا دەیبیـنین، ئەمـەش ڕاسـتییەکی مێـژوویی‌و جوگرافییـەو، وەك بەڵگەیـەکیش لـەوبارەوە دەڵێم :

لەساڵی (٢٠١٤)ز دا، سـەردانێکی سـێ لـە وڵاتـانی ئەسـکەندەنافیا: سوید، نـەرویج، فنلەنـدا، مـان کـرد، لەشـاری (یۆتۆبـۆریی) لەسـوید، چووینە سەر چیایەکی بەرز بەرانبـەر شـارەکە، کەڕەنگـە کیلۆمـەترێك زیاتر لەئاستی شارەکە بەرزتر بێ، لەسـەر دونـد (لووتکـە)ی چـیایەکە میلە) یەکی لێ بوو ، لێی نووسرابوو :

ماوەی دەهەزار (١٠٠٠٠) ساڵ لەمەو بەر، ئەم چیایە بەبەرزیی سەد مەتر (١٠٠)م ناوی دەریای لەسەر بووە!

ئنجا زانایانی پسپۆڕو شارەزای مێژوو وجوگرافیای زەمین دەڵێن: کاتی خۆی هەردووك کیشوەر (قارة)ی ئەمریکای سەروو خواروو، بەکێشوەری ئەورووپاوە لکاونو، دواتر ئەو گۆڕانکارییە ڕوویداوە، لەڕووکاری زەمیندا، کە ئێستا دەیبینینو کیشوەرەکان بەو جۆرەیان لێهاتووە.

لێرەش دا کۆتایی بەم تەوەری سێیەمەش دێنینو، خوا پشتیوان بێ هەرکات پێویستی کرد، هەر پرسیارو ئیشکالێکی دیکە هەبێ، بەم جۆرە تەمو مژەکەی دەڕەوێنینەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

٢٩ جمادي الثانية ١٤٣٨ك

٢٨ مارس ٢٠١٧ ز

هەولێر

# پێڕستە وشە

# لە بەرهەمەکانی نووسەر

| قــورئـــان و ســونـنـەت | | |
| --- | --- | --- |
| .١ | پوختەیەك دەربارەی ئیســـلام لـەبەر ڕۆشنایی ســورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/ ١٩٨٤<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ |
| .٢ | با لـە خزمەت قورئاندا بین، {كۆی هەردووك كتێبی: (چۆن باشتر لـە قورئان بەهرەمەند دەبین؟) وە (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/ ٢٠٠٨<br>چاپی دوو/ ٢٠١٥ |
| .٣ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكـەم: ســوورەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/ ٢٠١٢ |
| .٤ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : ســوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/ ٢٠١٢ |
| .٥ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سـێیەم: ســوورەتی: (النســاء) | چاپی یەك/ ٢٠١٣ |
| .٦ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: ســوورەتی: (الـمائدة) | چاپی یەك/ ٢٠١٤ |
| .٧ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: ســوورەتی: (الأنعـام) | چاپی یەك/ ٢٠١٥ |
| .٨ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی شەشەم : ســوورەتی: (الأعــراف) | چاپی یەك/ ٢٠١٦ |
| .٩ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/ ٢٠١٦ |

| | | |
|---|---|---|
| .10 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/2017 |
| .11 | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/2015 |
| | **بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی** | |
| .12 | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچکان | چاپی یەك/1985<br>چاپی سێ/2006 |
| .13 | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/1996 |
| .14 | بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/2001<br>چاپی سێ/2014<br>وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| .15 | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/2002<br>چاپی شەش/2016<br>وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیو تورکییو فارسییش |
| .16 | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/2002<br>چاپی دوو/2009 |
| | **مەوسووعەی : ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا ( 6 بەرگ )** | چاپی یەك/2006-2008<br>چاپی دوو/2016 |
| .17 | بەرگی یەکەم: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | |
| .18 | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتییدا | |

| | | |
|---|---|---|
| ١٩. | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | |
| ٢٠. | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | |
| ٢١. | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | |
| ٢٢. | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | |
| ٢٣. | ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کامەیە !؟ | چاپی یەك/١٩٨٩ دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |
| ٢٤. | سوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/١٩٩٧ دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| ٢٥. | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی سێ/٢٠١٥ زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی) و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٢٦. | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢ چاپی سێ/٢٠١٤ |

| | | |
|---|---|---|
| .٢٧ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طـه حاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٤ |
| .٢٨ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طه حـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ |
| .٢٩ | سیکۆلاریزمو دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵێ) | چاپی یەك/٢٠١٦ |
| | **فیقهی ئیسـلامیی** | |
| | **مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسـلامیی (٤ بەرگ)** | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ |
| .٣٠ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاكو خاوێنیی | |
| .٣١ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین درووشمی خواپەرستیی | |
| .٣٢ | بەرگی سێیەم: زەکاتو ماڵ بەخشین | |
| .٣٣ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەجو عومرەکردن، زیکری خواکردن | |
| .٣٤ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسـوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لـەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چـاپی یەك/١٩٩٩<br>بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوە |
| .٣٥ | جـەژن و یـادو بۆنەکانو هەڵسـەنگاندنێك | چـاپی یەك/٢٠١٣ |
| .٣٦ | چـەند بابەتێکـی هونـەریی لـەبەر ڕۆشـنایی قورئـانو سـوننەتـدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥<br>بۆ زمـانی فارسـییش تەرجەمـە کـراوە |
| .٣٧ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵو سـامان بەخشین لـەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ |

| تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار | | |
|---|---|---|
| .٣٨ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ |
| .٣٩ | ڕێگای صاڵح بوون‌و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢<br>وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی‌و فارسییش |
| .٤٠ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ |
| .٤١ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان‌و وازهێنان لە گوناه و سەرپێچیی‌و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ |
| .٤٢ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ |
| .٤٣ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دوارۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ |
| .٤٤ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ |
| .٤٥ | مەوسووعەی: ڕەوشت‌و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ |
| **بانگەوازو کاری ئیسلامیی** | | |
| .٤٦ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ |
| .٤٧ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ |
| .٤٨ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٩. | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ |
| ٥٠. | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ |
| ٥١. | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ |
| ٥٢. | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەشو ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٧ |
| ٥٣. | ئیسلامو کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ |
| ٥٤. | زانایانی ئیسلام کێنو چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١<br>وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٥٥. | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانجو هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ |
| ٥٦. | چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٥٧. | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ |
| ٥٨. | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ |
| ٥٩. | بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ |
| ٦٠. | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێو چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ |
| ٦١. | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشكو برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ |
| ٦٢. | ئیسلامو مسوڵمانەتییو کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ |

| | | |
|---|---|---|
| .٦٣ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ |
| .٦٤ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>**ئاڵقەی یەکەم**: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>**ئاڵقەی دووەم**: بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ |
| .٦٥ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك / ٢٠١٥ |
| .٦٦ | با لادانو تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ |
| .٦٧ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاوێشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/٢٠١٥ |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | |
| .٦٨ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعیجیەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ |
| .٦٩ | ئاڵقەی دووەمو سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ |

| | | |
|---|---|---|
| ٧٠. | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعی یانەو ژێرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ |
| | **وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان** | |
| ٧١. | کارو پڕۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ |
| ٧٢. | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ |
| ٧٣. | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمانو واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٢٠١٥/٥/٣٠ | چاپی یەك/٢٠١٦ |
| | **نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد** | |
| ٧٤. | کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ |
| ٧٥. | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری گاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ |
| ٧٦. | سۆزی نەتەوایەتییو بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی سێ/٢٠٠٥ |
| ٧٧. | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمانو پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ |
| | **سیاسەت و حوکمڕانیی** | |
| ٧٨. | چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵو وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ |
| | **مەوسووعەی: ئیسلامو دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ)** | چاپی یەك / ٢٠١٤<br>-٢٠١٦ |

| | | |
|---|---|---|
| .٧٩ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سرووشتو بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | |
| .٨٠ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستەمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | |
| .٨١ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان): یاسادانان جێبەجێکردن دادوەریی | |
| .٨٢ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | |
| .٨٣ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ |
| | **ئافرەت و خێزان** | |
| .٨٤ | ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانیو ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك /٢٠٠٣ |
| .٨٥ | مەوسووعەی : ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢ بەرگی یەكو دوو چاپی سێ/٢٠١٣ |
| | **مێژوو** | |
| .٨٦ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرسو پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی سێ/٢٠١٣ |
| .٨٧ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم | چاپی یەك/٢٠١٥ |

| | | |
|---|---|---|
| **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| .٨٨ | سنووره قەدەغەكان مەشكێنن! (چاوپێكەوتنی دكتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/ ٢٠٠١<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٤ |
| .٨٩ | ئەشكەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیستو دوو مانگ لە زیندانی داگیركەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩<br>وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی كراوەو چاپو بلاوكراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| .٩٠ | گەنج لە چەمكە هەنووكەییەكاندا | چاپی یەك / ٢٠١٠ |
| **زنجیرەی بابەتە هەنوكەییەكان** | | |
| .٩١ | گەنجەكانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی كردنەوەدا | چاپی یەك/ ٢٠٠٦<br>بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| .٩٢ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت كۆمەڵگاكەمان بەرەو هەڵدێر دەبات | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ |
| .٩٣ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین ؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٧ |
| .٩٤ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگو بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی | چاپی یەك / ٢٠٠٧ |

| ٩٥. | سیاسەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونکردنەوەیەك | چاپی یەك / ٢٠٠٧ |
|---|---|---|
| ٩٦. | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی | چاپی یەك / ٢٠٠٦ بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ٩٧. | قوتابیانی زانیاری شەرعیی‌و چەند سەرنج‌و ڕێنمایی یەك | چاپی یەك / ٢٠٠٧ |
| ٩٨. | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە | چاپی یەك / ٢٠٠٧ |
| ٩٩. | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٧ بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١٠٠. | قوتابیان لەم هەل‌و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن‌و چی بکەن ؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٨ |
| ١٠١. | واقیعی هەرێمی کوردستان ، دیدێکی ئیسلامییانە | چاپی یەك / ٢٠٠٨ |
| ١٠٢. | سروشت‌و پایەکانی خێزان‌و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع‌و عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٠٩ ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١٠٣. | کاری ئیسلامیی‌و ڕەواندنەوەی چەند تەم‌ومژێك | چاپی یەك / ٢٠١١ |
| ١٠٤. | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/ ٢٠١١ |
| ١٠٥. | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێك | چاپی یەك / ٢٠١١ |
| ١٠٦. | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون‌و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا | چاپی یەك / ٢٠١٢ |

| | | |
|---|---|---|
| .١٠٧ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ |
| .١٠٨ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی | چاپی یەك / ٢٠١٢ |
| .١٠٩ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە | چاپی یەك / ٢٠١٢ |
| .١١٠ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر | چاپی یەك ٢٠١٧ |
| | **کتێبە عەرەبییەکان** | |
| | **موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله** | ط الاولى/٢٠١٤<br>ط الثانية/٢٠١٦ |
| .١١١ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | |
| .١١٢ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | |
| .١١٣ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط الاولى/٢٠١٧ |
| .١١٤ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الاولى/٢٠١٧ |
| .١١٥ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | |
| .١١٦ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | |
| .١١٧ | الكتاب السادس: القرآن العظيم | |
| .١١٨ | الكتاب السابع: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | |
| .١١٩ | الكتاب الثامن: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | |

| | | |
|---|---|---|
| .١٢٠ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | |
| .١٢١ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | |
| .١٢٢ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | |
| .١٢٣ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | |
| .١٢٤ | نقض فكرة التطرف (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | ط الاولى/٢٠١٦<br>ط الثانية/ ٢٠١٧ |
| .١٢٥ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ |
| .١٢٦ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ |
| .١٢٧ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى /٢٠١٦ |
| | **ئەو كتێبانەی لەژێر چاپن** | |
| .١٢٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەڕێز، بەرگی هەشتەم: سووڕەتی: (یونس) | |
| .١٢٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەڕێز، بەرگی هەشتەم: سووڕەتی: (هود) | |
| .١٣٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەڕێز، بەرگی هەشتەم: سووڕەتی: (یوسف) | |
| | **مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحییو واقیعدا** | |
| .١٣١ | بەرگی یەکەم: ڕوونکردنەوەی چەمكو چییەتو چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | - |
| .١٣٢ | بەرگی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | |

| | | |
|---|---|---|
| ١٣٣. | بەرگی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سیاسییەکانی مێژووی مسوڵمانان | - |
| ١٣٤. | بەرگی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | - |
| ١٣٥. | بەرگی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | - |
| ١٣٦. | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان | |
| ١٣٧. | حوارات فكرية وسياسية ساخنة مع الشيخ علي باپـير | |
| ١٣٨. | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القران والسنة | ط الاولى/٢٠١٢_ |
| ١٣٩. | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩ |
| ١٤٠. | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ |
| ١٤١. | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ |
| ١٤٢. | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | |
| ١٤٣. | الاصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | |
| ١٤٤. | كيف نتعامل مع الناس؟ | |

# ناوەڕۆك

## ئەم نووسراوە:

بە کورتی و پوختی دوو بابەتی گرنگی تێدا دەروشێنراونەوەو توێژراونەوە، کە بریتین لە:

١) ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵ لەسایەی ئیمان دا، کە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی چ کاریگەرییەکی ئەرێنی لەسەر تاك و کۆمەڵ دادەنێ، لەکاتێکدا، کە لە عەقڵ و دڵی مرۆڤدا ڕەگ و ڕیشە دادەکوتێ و دەچەسپێ!

٢) ڕەواندنەوەی تەم و مژی هەژدە (١٨) دانە لەو گومان و تۆمەتانەی ئاڕاستەی ئیمان و ئیسلام دەکرێن بە تیشکی خۆری عەقڵ و وەحی و زانست.



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice
1500 دینار